

# مەریخ و ڤینۆس لە خۆشەویستیدا

## چیرۆکە دڵڕفێن و ئیلهامبەخشەکانی پەیوەندییە سەرکەوتووەکان

د. جۆن گرەی

نوسەری کتێبی هەرە پڕفرۆشی
«پیاوان لە مەریخەوە هاتون و ژنانیش لە ڤینۆسەوە»

# مەریخ و ڤینۆس
# لە خۆشەویستیدا



**چیرۆکە دڵڕفێن و ئیلهامبەخشەکانی**
**پەیوەندییە سەرکەوتووەکان**

نوسینی: د. جۆن گرەی

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: یاسار شێرکۆ عەبدوڵڵا

ناوی کتێب: مەریخ و ڤینۆس لە خۆشەویستیدا

ناوی نوسەر: د. جۆن گرەی

ناوی وەرگێڕ: پاسار شێرکۆ عەبدوڵڵا

تایپ و دیزاین: سیروان خەلیل

بابەت: پەروەردەیی/ خێزانی

چاپخانەی: شڤان

تیراژ: ۱۰۰۰ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (۱٤٥۲)ی ساڵی (۲۰۱٥)ی پێ دراوە.

لە بڵاوکراوەکانی هیوا فاوندەیشن

ناونیشان: عێراق، هەرێمی کوردستان، سلێمانی، کۆمەڵگای نیشتەجێیی بەهاران

ئیمەیڵ: info@hiwafoundation.org

وێبسایت: www.hiwafoundation.org

به قوڵترین خۆشەویستی و سۆزەوە، ئەم کتێبە پێشکەشە بە

هاوسەرەکەم (بۆنی گرەی). خۆشەویستییەکەی،

ناسکییەکەی، ژیری و بەهێزییەکەی وایان لێ کردم

جار لەدوای جار خۆشترم بوێت

# ناوەڕۆك

# پێزانین

سوپاسی (بۆنی گرەی)ی هاوسەرم دەکەم کە لە گەشتی ئامادەکردنی ئەم کتێبەدا هاوڕێم بو. سوپاسی دەکەم کە بەوپەڕی پشوودرێژییەوە پشتگیری کردم و سەرباری ئەوەی کە نوسین و سیمینار گێڕان تەواو سەرقاڵیان کردبوم کەچی ئەو هەمیشە من و پەیوەندییەکانمانی لەبیرە.

سوپاسی سێ کچەکەمان دەکەم، (شانۆن) و (جولی) و (لاورێن) سەبارەت بە خۆشەویستی و هاندانی بەردەوامیان. زۆر خۆشە کە لە ئەنجامدانی کارەکەمدا هەست بە پشتگیری خێزانەکەم دەکەم. سوپاس بۆ تۆ (لاورێن) کە لە نوسینەوەی یەکەمین بەشی ئەم کتێبەدا یارمەتیی دام. سوپاسیشت دەکەم سەبارەت بەو پەیام و وتە بەنرخانەی کە بۆ هاندانم، لەسەر کۆمپیوتەرەکە بۆت دانابوم.

سوپاسی بریکارەکەم (پارێزەرەکەم) (پاتی برێیتمان) دەکەم کە یەکەم جار پێشنیاری ئامادەکردنی ئەم کتێبەی کرد، سەبارەت بە هاوڕێیەتی و پشتگیرییە بەردەوامەکانی. سوپاسی بریکارە نێودەوڵەتییەکەم (لیندا مایکڵس) دەکەم بەرامبەر بە بڵاوکردنەوەی کتێبەکانم بە جیهاندا بە سیو حەوت زمانی جیاواز.

سوپاسی (سوزان لیپسێت) دەکەم کە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری زیاتر چاوپێکەوتنی لەگەڵ زۆرێك لەو کەسانەدا کرد کە نامەیان نوسیبوو. یارمەتییەکانی ئەو لە بواری نوسیندا بە رادەیەکی زۆر ئەم کتێبەی بەرەوپێش بردو کارەکەی بۆ ئاسان کردم. سوپاسی (دەین ریڤەرێند) دەکەم سەبارەت بە سەرنجە پیشەییەکانی و ئامۆژگارییەکانی لە بواری نوسیندا.

سوپاسی (جاك مەكیۆون) دەكەم كە بەردەوام لە ئاراستەكردنی ئەم كارەمداو پشتیوانی كردم و بلیمەتییەكی وا گەورەی نواند لە بە بازاڕكردندا كە بووە هۆی ئەوەی كتێبەكانم بكەونە بەردەستی خوێنەران. سوپاسی كارمەندانی (هارپەركۆڵینز) دەكەم كە وەڵامی داخوازییەكانیان دەدامەوە.

سوپاسی (مایكڵ ناژاریان) دەكەم سەبارەت بە ڕێكخستنی بەردەوامی سیمیناری فرۆشتن لە سەرتاپای وڵاتدا. سوپاسی (سوزی هاریس)ی یاریدەدەرم دەكەم كە پشتیگرییەكی دڵسۆزانەی كردم لە ڕێكخستنی شوێنی كارەكەم و خشتەی كاتەكانم. سوپاسی (ڕێگیی هێنكارت) دەكەم سەبارەت بە فراوانكردنی مەودای (سیمینارەكانی جۆن گرەی) بە چواردەوری جیهاندا. سوپاسی ڕێكخراو و بانگەشەكارە جیاجیاكان دەكەم لە شارە جیاوازەكان كە بانگێشتیان كردوم لە ناوچەكانیان سیمینار بگێڕم. سوپاسی (بارت) و (مێرێڵ بێرێنس) دەكەم سەبارەت بە دەستپێكردنی (مەریخ و ڤینۆسی یارمەتیدراو)ی نوێ. سوپاسی (رامی ئەلبەتراوی) دەكەم لە (جنییسس مدیا ئەند پۆزەتیڤ ریسپۆنس تی ڤی) بەرامبەر بە ئاگادارییە بازرگانییە زۆر سەركەتووەكانی.

سوپاسی ئەو هەزاران تاك و كەپڵانە دەكەم كە كاتی خۆیان تەرخانكرد بۆ باسكردنی تێگەیشتن و گێڕانەوەی چیرۆكەكانیان بۆ من كە چۆن تێگەیشتنیان لە (پیاوان لە مەریخەوە هاتون و ژنان لە ڤینۆسەوە) كاریگەری ئەرێنی كردۆتە سەر ژیانیان. بەبێ چیرۆكەكانی ئەوان و بەبێ بەشداریكردنیان لەم پرۆژەیەدا، كتێبی (مەریخ و ڤینۆس لە خۆشەویستیدا) هەرگیز نەدەنوسرا.

# پێشەكی



وەك نوسەری كتێبی (پیاوان لە مەریخەوە هاتون و ژنانیش لە ڤینۆسەوە) بەردەوام سود لە بیستنی چیرۆكی ئیلهامبەخشی سەركەوتنی تاك و كەپڵەكان دەبینم. من بە كردەوە، هەمو رۆژێك كەسێك بیرم دەخاتەوە و بە زەردەخەنەیەكەوە سوپاسم دەكات هەقی نوسینی "ئەو كتێبە". چەند ساڵێك بەم كاردانەوەیە سەرسام بوم. دەمزانی سیمینارەكانم ئەزمونی گوێزەرەوە بون و یارمەتی پاراستنی هەزاران هاوسەرگیرییان داوە، بەڵام نەمدەزانی تەنیا خوێندنەوەی كتێبێكیش هەمان كاریگەری هەیە.

لە پێشكەشكردنەكاندا، كە هەزاران كەس گوێیان بۆ قسەكانم دەگرت، دەمبینی چۆن بیرۆكەیەك یان چیرۆكێكی بچوك بەناو جەماوەرەكەدا تێدەپەڕێت و روخساری خەڵكەكە وەكو گڵۆپ دادەگیرسێنێت. چیرۆكێك دەگێڕمەوە و دەستبەجێ دەبینم خەڵكەكەی ناو ئەو ژورە بەراستی و دەستبەجێ گۆڕانكارییان بەسەردا دێت. شەپۆلێكی پێزانین و ئاسودەیییەكی مەزن پەیدا دەبێت و هەندێك جاریش قاقایەكی پێكەنینی بەدوادا دێت كە بەگشتی نیشانەی ئەمجۆرە كاردانەوانەیە:

٭ ئەو دەزانێت من هەست بە چی دەكەم. دەشێت خەڵكی دیكەش ئەو هەستەیان هەبوبێت. كەچی من خۆم وام هەست دەكرد تەنیا منم لە جیهاندا كە نەیتوانیوە لە خۆشەویستیدا سەركەوتو بێت.

٭ ئەو بە شێوەیەك باسی كێشەكانی ئەو كەپڵە دەكات كە زۆر ئاسایی دەربكەون نەك شێتانە. ئایا ئەمە مانای وایە كە ئەو ئاڕاستەیەی هاوسەرگیرییەكەمانی پیادا تێدەپەڕێت ئاساییە؟

* پەککو! بە تەنیا هەر من نیم. خەڵکی دیکەیش هەستیان بەوە کردووە.

* ئەها، کەواتە بۆیە فلانە شت رویدا. ئێستا تێگەیشتم. دەتوانم مامەڵەی لەگەڵدا بکەم. هێندە ئەستەم نییە.

ئەم ئەزمونی "گلۆپ"انە شتی بچوك نین. ئەمانە خێران، بەڵام تێپەڕ نین. لەو هەمو روداوانەی کە ئەزمونیان دەکەین رەنگە هیچیان هێندەی پەیوەندییەکان گۆشەگیرمان نەکەن. پێناسەکردن و باسکردنیان سەختن، بەتایبەتی بە شێوەیەك کە داوای هاوسۆزی و تێگەیشتن لە بەرامبەرەکەمان لەخۆ بگرێت. کاتێك شتەکان سەرکەوتو نابن و ئێمەش نازانین چۆن دەربانبڕین یاخود تێناگەین کە ئەوە چییە روودەدات، ئیتر بەشێوەیەکی سروشتی گومانمان لەلا دروست دەبێت.

ئەو ماوەیەی کە داگیرسانی گلۆپێك دەیخایەنێت، بە ئاشکرا دەبینیت کە لێرەو لەوێ ئامادەبووەکان بەم پەیامە یاخود بە پەیامێکی دیکە گۆڕانیان بەسەردا دێت — ئەم پەیامەیان بەلاوە گرنگە:

* ئێمە ئەوەمان تێپەڕاندووە! هیچ کێشەیەکمان نییە!

* ئەوە لە چیرۆکەکەی من دەچێت، کەواتە تەنیا نیم.

* من هەمیشە وام زانیوە کە خۆشەویستی بەسە، بەڵام وابزانم بابەتگەلی دیکەش هەن کە دەبو بمانزانیایە بۆ ئەوەی سەرکەوتو بین.

لە سیمینارەکاندا بانگێشتی تاك و کەپڵەکان دەکەم کە هەستنە سەرپێ و نمونەی ناو ژیانی خۆیان باس بکەن. ئەو زانیاریانەی کە سەبارەت بە جیاوازییەکانی نێوان پیاوان و ژنان دەیانخەمە رو بە دڵنیاییەوە زۆر بەسودن، بەڵام ئەوە هەر چیرۆکە کە بە باشترین و خێراترین و دراماتیکیترین و فەرامۆشنەکراوترین شێوە بیرۆکەکە بەرجەستە دەکات.

کە بەشدارەکان باسی نمونەکانی خۆیان دەکەن کە چۆن بەکارهێنانی زانیاری و تێگەیشتنەکانیان بۆ باشترکردنی پەیوەندییەکانیان، بۆتە هۆکاری ئەوەی لەپڕ هەمو شتەکان پێك بێنەوە، زۆرجار کەسێك چیرۆکێك دەگێڕێتەوە کە راستەوخۆ خەڵکانی دیکە خۆیانی تیا دەبیننەوەو بەمەش روخسارەکان بە خۆشی و ئیلهام و ئاسودەییەوە دەگەشێنەوە.

کتێبی (مەریخ و ڤینۆس لە خۆشەویستی‌دا) کتێبی نمونە تایبەتەکانی پەیوەندییە سەرکەوتووەکانە – واتە کۆکراوەی چیرۆکی راستەقینەیە. رەنگە تۆ خۆت لە هەمو یەکێك لە چیرۆکەکاندا نەبینیتەوە، بەڵام چەند دانەیەك بەسن بۆ ئەوەی هەقیقەتەکەی خۆتت لەلا بەرجەستە بکەن، شتێکت لەبارەی چیرۆکی خۆشەویستییەکەی خۆت نیشان دەدەن کە رەنگە دەمێك بێت خۆی لێ شاردبیتەوە. لەگەڵ هەمو چیرۆکێکدا ئەو روونی و خۆشەویستییە بەدەست دەهێنیت کە خەڵکی دیکە وەکو تۆ بەدەستیان هێناوە بۆ ئەوەی خۆشەویستی لە ژیانیاندا سەربخەن.

- ئەم چیرۆکانە راستەوخۆ لەو تاکە کەس و کەپلانەوە سەرچاوەیان گرتووە کە بەشداری سیمینارەکانیان کردوم، یاخود نامەیان بۆ شوێنی کارەکەم بۆ ناردوم. ساڵانە هەزاران نامەم بەدەست دەگات، کە لە دڵەوە نوسراون و چیرۆکی خۆشەویستی دەگێڕنەوە. ئەوانەی ئەم نامانە دەنوسن ژن و مێردەکان یاخود خۆشەویستەکانن یاخود ئەوانەن کە بەشوێن خۆشەویستیدا دەگەڕێن؛ ئەوانەن کە پەیوەندییەکانیان لەسەر لێواری دارمان بووە، بەڵام بەهۆی ئەو شتانەی لە کارەکانی مندا دۆزیویانەتەوە لە روخان پارێزراون.

هەندێکیان ئەو خوێنەرو گوێگرانەن کە لە دڵەوە هاوبەشەکەی خۆیان خۆش دەوێت، بەڵام بەهۆی کتێب و کاسێت و کۆڕەکانی منەوە رێگەی نوێیان دۆزیوەتەوە بۆ دەوڵەمەندکردنی پەیوەندی خۆشەویستییەکەیان لەودیو هەمو وێناکردن و چاوەڕوانییەکانەوە. هەندێکیان ئەو کەسە رەبەنانەن کە ئەگەرچی لە ژیانیاندا بەشوێن خۆشەویستی‌دا گەڕاون، بەڵام هەتا ئەوکاتەی فێری جیاوازییەکانی نێوان ژن و پیاو و رێزگرتن لەو جیاوازییانە بون، هەرگیز بە تەواوی بەدەستیان نەهێناوە.

هەندێك جار لە کۆتایی نامەکانیاندا دەنوسن "ئەگەر دەزانیت کە چیرۆکەکەی من سودی بۆ خەڵك دەبێت، تکایە بە ئارەزوت بەکاری بهێنە." رۆژێکیان کە بیرم لەمە دەکردەوە بۆم دەرکەوت ئەمە بیرۆکەیەکی زۆر چاکە. ئەگەر چیرۆك و نمونە راستەقینەکان ئەو کاریگەرییە گوێزەرەوە دەستبەجێ و هەتاهەتاییەیان هەبێت وەك لە دانیشتنەکانی ناو سیمینارەکانمدا هەیانە، بۆچی کۆمەڵێکیان لە کتێبێکدا کۆنەکەمەوە؟

کتێبی (مەریخ و ڤینۆس لە خۆشەویستی‌دا) ئەو بیرۆکە سەرەتاییانە لەخۆ دەگرێت کە لە کتێب و کاسێتەکان و سیمینارەکانمدا خراونەتەڕوو، بەڵام بە کردەوە لە

ژیانی خەڵکدا، لە ناوەوە، ئەو دەرفەتەت پێدەبەخشن کە لە چیرۆکی کەسانی دیکەوە خۆت ببینیتەوە و شێوازەکانی خۆت لەو بارودۆخانەدا بناسیتەوە کە باسکراون. لەڕووە دەروونناسییەکەوە، ئەم کتێبە دەرفەتێکی بێمەترسی و تایبەتت دەداتێ کە لە ڕێگەی خەڵکەوە فێرببیت، بەڵام بە دەربڕینەکەی ژیانی ڕۆژانە ئەم کتێبە بە سەدان ڕێگەی جیاواز چەند واقیعێکی ئاسودەبەخشت نیشان دەدات کە:

* ئەو کێشانە لە خۆشەویستیدا ئاساین، زۆر ئاساییە مرۆڤ ئەگەر لە پەیوەندییەکانیدا کێشەی هەبێت.

* زۆربەی زۆری خەڵك لە هەوڵی چارەسەرکردنی کێشە سۆزدارییەکاندان.

* تەنانەت هەڵەی گەورەی وەك خیانەتیش دەتوانرێت لێی ببوردرێت و چارەسەر ببێت،

* تەنانەت لەوکاتەشدا کە تۆ بە قوڵی لە خۆشەویستیدایت، ئەگەر چەند ڕاستییەکی دیاریکراو سەبارەت بە ژن و پیاو نەزانیت ئەوا خۆشەویستییەکەت سەرکەوتو نابێت،

* ژن و پیاو بەراستی لەیەکتری جیاوازن، و

* کلیلی خۆشەویستی و بەردەوامبون تیایدا بریتییە لە ناسینەوەی ئەو جیاوازییانەو قبوڵکردنیان.

دیارە هەندێك لە چیرۆکەکان دڵ گەرمی بە مرۆڤ دەبەخشن و ئەوانی دیکە خۆش و گاڵتەئامێزن. چی لەوە ئاسودەبەخشترە کە ببیستیت پەیوەندییەکی خۆشەویستی کە لەسەر لێواری داڕوخان بووە لەپڕ دەبوژێتەوە؟ هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لە چۆنێتی بەدیهاتنی ئەم گۆڕانکارییە بریتییە لەو شتەی کە وامان لێ دەکات لە موبەق بمێنینەوە دوای ئەوەش کە خواردنەکە تەواو بووە، کوپێك قاوەی دیکە تێبکەین و سەرلەنوێ وردەکاری بەسەرهاتێکی خۆمان یاخود هی کەسێکی دیکە باس بکەین. هیوام ئەوەیە کە ئەزمونی خوێندنەوەی ئەم کتێبە بۆ ئێوە وەك مانەوەی دوای ژەمە خواردنێك وابێت، بیر لە خۆشەویستی بکەنەوە و لەپڕ دابگیرسێن – وەکو گڵۆپ! – بەوەی کە بۆت دەردەکەوێت بڵێیت "ئۆه! ئەوە منم!" یان "تەماشای ئەمە بکە ئازیزەکەم! باسی ئێمە دەکەن!"

# ١

## مەریخ و ڤینۆس لە خۆشەویستیدا



وا دابنــێ پیــاوان لــە مەریخــەوە هــاتون و ژنــانیش لــە ڤینۆســەوە. زۆر بــەر لــە ئێســتا رۆژێکیــان مــەریخی‌یــەکان بــە ســواری کــەشتی‌یــە ئاسمانییــەکانیان گەشتیان کــرد بــەرەو ڤینۆس. هەر کە گەیشتن لە یەکەم نیگاوە لەگەڵ ڤینــۆسی‌یەکانــدا عاشقی یــەکتری بــون. مەریخی‌یەکان و ڤینۆسی‌یەکان هەردولا شێتانە عاشقی ئەوی دیکە بــون و هاوســەرگیرییان کردو ژیانێکی کامەران بەسەربرد — تا ئەو کاتەی بڕیاریاندا سەردانی زەوی بکەن ..

لــە ســەرەتادا شــتەکان بــێ کــەموکوڕی بــون، بــەڵام پــاش ماوەیــەك کاریگەرییــەکانی کەشی زەوی خــۆی ســەپاند. ژنــانیش و پیــاوانیش توشــی "نەخۆشــی بیرچــونەوە" بــون. بیریان نەما کە هەریەکەیان لە هەسارەیەکی جیاوازەوە هاتووە.

کاتێکیش ئەوەیان بیر چووەوە کە چۆن لە یــەکتری جیــاوازن، مــەریخی‌یــەکان هاتنــە سەر ئەو باوەڕەی کە بڵێن ڤینۆسی‌یەکان پێویستیان بە چاککردنەوە هەیــە، لــە کاتێکــدا کە ڤینۆسی‌یەکان وایان دەزانی مەریخی‌یەکان پێویستیان بە پەرەپێدان هەیە. کــاتێکیش خۆیــان ئامــادەکرد یــەکتری "بگــۆڕن"، ئــەو خۆشەویســتییەی لەســەرەتادا هەســتیان پێ‌کردبو وردە وردە دەپوکایەوە.

هەرچەندە زوربەی مەریخی‌یەکان و ڤینۆسی‌یەکان بیریان چۆوە کــە جیــاوازن، بــەڵام هەنــدێکیان هــەر بیریــان بــو. ئــەم کەســە خۆشــبەختانە دەیــانزانی کــە ئــەمان لــە دوو هەســارەی جیــاوازەوە هــاتون. بــەم زانیارییــە تایبەتــەوە لەســەر پێکــەوە گەشــەکردن لــە خۆشەویستیدا، بەردەوام بون.

**هەرچەندە زۆربەی مەریخی و ڤینۆسییەکان جیاوازییەکەیان فەرامۆش کردبو، بەڵام هەندێکیان بیریان مابو. ئەوان لەسەر پێکەوە گەشەکردن لە خۆشەویستیدا بەردەوام بون.**

ئەم تاکە زانیارییە کە پیاوان لە مەریخەوە هاتون و ژنانیش لە ڤینۆسەوە — کلیلە ونبووەکەی ئەو هەزاران کەپڵە بو کە دەیانویست خۆشەویستییەکەیان زیاتر ببێت، پەیوەندیکردنیان باشتر ببێت و سۆز لە پەیوەندییەکانیاندا بەردەوام بێت.

## چاوەڕوانی‌یە ناواقیعی‌یەکان

کە ئێمە بە هەڵە وا دەزانین ژنان و پیاوان یەك شتن، ئیتر لەپڕ پەیوەندییەکانمان پڕدەبن لە چاوەڕوانیی ناواقیعی. ژن پێی وایە پیاو پێویستە ئەو شتانە بکات کە ژنان لەکاتی خۆشەویستنی کەسێکدا دەیکەن. پیاوان وا دادەنێن کە کاردانەوەی ژنان بەهەمان شێوەی کاردانەوەی پیاوانە کاتێ کەسێکیان خۆش دەوێت. بەبێ تێگەیشتنێکی روون سەبارەت بەو رێگە جیاوازانەی ژنان و پیاوان دەیانگرنەبەر، سەیر نییە کە هەستەکانمان ئازاریان پێبگات و دواجار بکەوینە شەڕکردن لەگەڵ ئەوکەسەدا کە لە هەمو کەسێك زیاترمان خۆش دەوێت.

**کە ئێمە بە هەڵە وا دەزانین ژنان و پیاوان یەک شتن، ئیتر لەپڕ پەیوەندییەکانمان پڕدەبن لە چاوەڕوانیی ناواقیعی.**

لە رێگەی تێگەیشتن و لەیادبونی ئەوەی پیاوان لە مەریخەوە هاتوون و ژنان لە ڤینۆسەوە، دەتوانین لەژێر رۆشنایییەکی نوێدا لێکدانەوە بۆ هەڵسوکەوتەکانی هاوبەشەکانمان بکەین. جەنگە دێرینەکەی نێوان دوو رەگەزەکە دەبێت بە لێکتێگەیشتنی نێوان دوو رەگەزەکە. شتێکی زۆر سیحراوی لە پەیوەندییەکانماندا رودەدات؛ دڵمان پڕ دەبێت لە تیشکە گەرموگوڕەکەی لێبوردن و بە ئیلهامی هەستی

توانایەکی نوێوە دەست بە بەدیهێنانی هیواو خەونەکانمان دەکەین.

لەپڕ پەیوەندییەکانمان زۆر بە جیاواز دەردەکەون. دەبینین کە هاوبەشەکانمان هەوڵی زۆر دەدەن بۆ ئەوەی خۆشەویست بن و بە ڕێگە تایبەتەکەی خۆیان ئەوپەڕی هەوڵی خۆیان دەدەن. بەم تێگەیشتنە نوێیەوە دەتوانین هەوڵە زۆرەکانی هاوبەشەکەمان بۆ خۆ خۆشەویستکردن بناسینەوە. پەڵە هەورەکانی سەرلێشێوان و تووڕەیی و بێ ئومێدی دەڕەوێنەوەو لەپڕ کارو کاردانەوەکانیان مانا دەبەخشن.

**جەنگە دێرینەکەی نێوان دوو ڕەگەزەکە دەبێت**
**بە لێکتێگەیشتنی نێوان دوو ڕەگەزەکە.**

ئەگەر بتوانین بە ڕوونی مەبەستە میهرەبانەکەی هاوبەشەکەمان ببینین، پەیوەندییەکانمان بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەست دەکەن بە گۆڕان. ئێمە لەبری ئەوەی هەست بکەین ڕەت دەکرێینەوە یاخود نانرخێندرێین، دەست دەکەین بە بینینی ئەو خۆشەویستییەی کە نەك هەر هەمیشە هەبووە بەڵکو ئەوەی کە ئێستاش هەر هەیە.

## کورتەیەك لەبارەی چیرۆکەکانەوە

بەم تێگەیشتنە گرنگە نوێیەوە، هەزاران کەپڵ بۆیان دەردەکەوێت کە چۆن خۆشەویستیی ناو پەیوەندییەکانیان ببوژێننەوە، هەریەکەیان بە شێوە تایبەت بێ وێنەکەی خۆی. بە درێژایی کتێبی (مەریخ و ڤینۆس لە خۆشەویستیدا) ئێمە باسی چیرۆکە ئیلهامبەخش و پڕ لە دڵسۆزییەکان دەکەین. لە ڕێگەی وشەکانی خۆیانەوە، ئێمە چیرۆکی سەرکەوتنەکانیان دەگێڕینەوەو لە هەڵەکانیانەوە فێردەبین.

چیرۆکەکانی ناو هەر بەشێك تێگەیشتنی نوێ و گرنگت پێدەبەخشن. هەرچەندە زۆرێك لەم بیرۆکانە لە کتێبەکانی دیکەی مندا باسیان لێوە کراوەو روون کراونەتەوە، بەڵام بیستنی ئەم چیرۆکانە یارمەتیت دەدەن دەست بخەیتە سەر هەندێك لە هەست و ئەزمونەکانی خۆت، لە هەندێك حاڵەتدا ڕێگەی تازەت نیشان دەدەن کە چۆن ئەو پەیوەندییە دروست بکەیت کە دەتەوێت.

گرنگە بزانیت کە هەمو کەسێك راستەوخۆ، خۆی لە هەمو چیرۆکەکاندا نابینێتەوە – مەرج نییە تۆش لە هەمو چیرۆکەکاندا خۆت ببینیتەوە. هەمو کەسێك ناچێتە خانەی ئەو باسکردنەوە سەبارەت بە جیاوازییەکانی ژن و پیاو. ئەم چیرۆکانە بۆیە هەڵبژێردراون چونکە زۆربەی ژنان و پیاوان خۆیانی تێدا دەبیننەوە. ئەگەر تۆ خۆت یاخود هاوبەشەکەتن چەند جارێك لەم کتێبەدا بینییەوە مانای وایە خاڵێکی گەڕانەوەت دەبێت بۆ ئەم بیرۆکانە لەگەڵ هاوڕێکانت و خێزان و پەیوەندییە سۆزدارییەکەتدا.

لە بەشی دووەمدا بە ناونیشانی "پیاوان لە مەریخەوە هاتوون و ژنان لە ڤینۆسەوە" چیرۆکەکان باس لەوە دەکەن کە چۆن تێگەیشتنێکی قوڵتر سەبارەت بە جیاوازییەکانی ژن و پیاو خۆشەویستییەکی بەردەوام دروست دەکات. تەنیا ئەگەر لە یادمان بێت کە ئێمە لە یەکتری جیاوازین ئیتر رزگارمان دەبێت لە هەستکردن بەوەی بەرامبەرەکەمان فەرامۆشمان دەکات و پێزانینمان بۆ دەرنابڕێت. ئیلهامی ئامادەییمان پێدەبەخشێت بۆ ئەوەی کاتی پێویست تەرخان بکەیت بۆ تێگەیشتن لە هاوبەشەکانمان و بۆ بەدەستهێنانی مەبەستەکانمان.

چیرۆکەکانی بەشی سێیەم، "پیاوان و ئەشکەوتەکانیان"، باس لەوە دەکەن کە چۆن تێگەیشتنی ژن لەوەی پێویستییەکی تەندروست و ئاساییە پیاو بگەڕێتەوە ناو ئەشکەوتەکەی خۆی و تێگەیشتن لەم راستییە دەتوانێت بە شێوەیەکی دراماتیکی پەیوەندییەکەیان گەشە پێبدات. زۆر ژن بۆیان دەرکەوتووە کە قبوڵکردنی ئەو پێویستییەی پیاو بۆ پاشەکشە ئەو بەرپرسیارێتییە لەسەر پیاوان لادەبات کە گوێگرێکی باشی ژن بن. ژنانیش ئەوەیان بۆ دەرکەوتووە کە ئەگەر پێویستییەکەی پیاو بۆ پاشەکشەکردن قبوڵ بکەن، پیاوەکە لە ئەشکەوتەکەی دێتە دەرەوە.

چیرۆکەکانی بەشی چوارەم "قسەکردن بە زمانی جیاواز" باس لەوە دەکەن کە چۆن ژن و پیاو لە پەیوەندیکردندا جیاوازی دەکەن – و تێگەیشتنان لە هۆکاری قسەکردن چەند جیاوازە لە هی یەکتر. ژن و پیاو بۆ گەیاندنی مەبەست و چارەسەرکردنی کێشەکانیان زمان بەکاردەهێنن، بەڵام ژنان زمان بەکاردەهێنن هەم بە مەبەستی دۆزینەوەی ئەو شتەش کە دەیانەوێت بیڵێن، بۆ ئەوەی هەستەکانیان دەرببڕن، و هەم زۆرجاریش بۆ ئەوەی ئەزمونی هۆگرییەکی زیاتر بکەن. چیرۆکەکانی

ئێرە ئەوە دەردەخەن کە ئەگەر پیاوان و ژنان لەم جیاوازییانە بگەن پەیوەندییەکانیان بە شێوەیەکی دراماتیکی بەرەو باشتر دەچێت.

لە بەشی پێنجەمدا، "مەریخییەکان بەرپێوەن"، ئەو چیرۆکانە خراونەتە روو کە باس لەو پەیوەندییانە دەکەن کە ئەوەندە برینداربن گەیشتونەتە لێواری داڕووخان — کەچی، بەهۆی تێگەیشتنە نوێیەکان سەبارەت بە جیاوازییەکانی نێوان ژن و پیاو ئەم پەیوەندییانە چارەسەر دەبن و دەست بە گەشەکردن دەکەن. لێرەدا ئەو ژن و پیاوانە دەبینین کە خۆشەویستییەکانیان گەشە پێدەدەن و رێگەی ئەوتۆ دەدۆزنەوە کە پێویستییەکانیان تێربکرێت و ئەمانیش پێویستییەکانی هاوبەشەکەیان تێربکەن، کە جاران هەر بێزاریی و سەرلێشواو بون.

لە بەشی شەشەمدا بە ناونیشانی "سڵاو لە مەریخ و ڤینۆسەوە"، باس لەو رێگایانە کراوە کە ژنان و پیاوان خۆشەویستیی پێدەبەخشن. بەبێ تێگەیشتنێکی روون لەم جیاوازییانە، ئێمە لە ئەزمونەکانی خۆشەویستی خۆمان تورەو بێهیوا دەبین. چیرۆکەکانی ئێرە نمونەی راستەقینەن کە بۆ پیاوان باس لە گرنگی دڵخۆشکردنی ژن دەکەن و بۆ ژنانیش باس لە گرنگی دەربڕینی پێزانین دەکەن بۆ هاوبەشەکانیان و دەستکەوتەکانیان.

دواجار لە بەشی حەوتەمدا، "مەریخ و ڤینۆس پێکەوە تا سەر"، تەماشای کێشە سەختەکانی ناو هەناوی هەندێك لە هاوسەرگیرییەکان دەکەین وەك — خراپ مامەڵەکردن و فێڵ و خیانەت. چیرۆکەکانی ئێرە لەیاد ناچن نەك تەنیا لەبەرئەوەی کاریگەرییە بەهێزەکەی ئەم کێشانە لەسەر خۆشەویستی دەخەنە روو، بەڵکو لەبەرئەوەش کە باس لەو رێگایانەش دەکەن کە پەیوەندییەکە لە دڵشکانەوە بەرەو پەیوەندییەکی بەهێز و تەندروست و پڕ لە خۆشەویستی دەبات.

لە هەریەك لە بەشەکانی ئەم کتێبەدا رێگەی نوێ دەدۆزینەوە بۆ پێکهێنان و بەکارهێنانی ئەم زانیارییە نوێیانە سەبارەت بە جیاوازییەکانی نێوان ژن و پیاو. هەریەك لەم چیرۆکانە ئاگاییەکی زیاتر دەهێنێتە ئاراوە کە چۆن کێشەو ناکۆکییە ناچارییەکان چارەسەر بکرێت کە نەك هەر لە پەیوەندییە سۆزدارییەکانماندا دێنە ئاراوە، بەڵکو تێکڕای ئەوانەش کە لە هەمو پەیوەندییەکانماندا دروست دەبن.

## سیحری باسکردنی چیرۆکەکان

بە بیستنی ئەم چیرۆکانە لەسەر پەیوەندییەکان، تا ئەو ئاستەی خۆت یان هاوبەشەکەت لەو چیرۆکانەدا دەبینیتەوە، بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی تێگەیشتنت بەهێزتر دەبێت سەبارەت بەوەی چی پەیوەندییەکان عاشقانەتر دەکات. تۆ بایەخی تەواو بەو شتانە دەدەیت کە پەیوەندییەکان سەردەخەن و لەخۆوە ئەو چۆنایەتییانە دەژێنەوە.

کاتێك بۆت دەردەکەوێت پەیوەندییەکەی تۆ لەچی کەمە، ئیتر لەبری ئەوەی تەنیا هەست بە زیانێك بکەیت، ئەگەرە نوێیەکان ئیلهامی ئەوەت پێ دەبەخشن کە ئاسودەیی بدۆزیتەوە. پێکەنین بە هەڵەکانی خۆت و هەڵەکانی هاوبەشەکەت، وا دەکات بێزارییە کۆنەکان بەرەڵلا ببن و دڵت پڕدەبێت لە سیحری خۆشەویستی و لێبوردن.

تۆ ئەگەر ئیلهام لەم چیرۆکی سەرکەوتنانەوە وەربگریت یاخود تەنیا سوپاسگوزاربیت بەرامبەر بەو خۆشەویستی و تێگەیشتنەی کە خۆت هەتن، ئەوا دڵنیا بە باسکردنی ئەو گۆڕانە تاکە کەسییانەی کەسانی وەك تۆ – کە تواناکانیان بۆ خۆشەویستی و ڕێزگرتن لە یەکتری گەشە پێدەدەن – ئەزمونێکی دەوڵەمەندکەر و بوژێنەرەوە دەبێت.

# ٢

# پیاوان لە مەریخەوە هاتون، ژنان لە ڤینۆسەوە



پیاوان و ژنان جیاوازن لە یەکتر. ئەوەندە جیاوازین کە هەندێك جار دەکرێت بڵێین لە دوو هەسارەی جیاوازەوە هاتوین. تەنیا لەیادبوونی ئەم تاکە بیرۆکەیە رزگارمان دەکات لە لۆمەکردنی هاوبەشەکانمان و یارمەتیمان دەدات کاتی پێویست بۆ تێگەیشتن لە داخوازی و پێویستییەکانی هاوبەشەکانمان تەرخان بکەین. لەبری ئەوەی رێگە جیاوازەکانی کارو کاردانەوەی هاوبەشەکانمان وەك نیشانەی لاوازی ببینین، یاخود وەکو مەیلی هەستە دەماری ئەوتۆ کە پێویستیان بە راستکردنەوە هەبێت، ئیتر دەست دەکەین بە خۆشویستن و قبوڵکردنی هاوبەشەکانمان وەکو خۆیان و بەو شێوەیەی کە هەن. لە تێکڕای ئەم چیرۆکانەی خوارەوەدا، ژنان و پیاوان باسی ئەوە دەکەن کە تێگەیشتن لە جیاوازییەکانی نێوان ژن و پیاو چەند یارمەتیدەرو دڵنیاکەرەوەیە.

## ئێمە تەنیا نین

(باربارا) ئەمەی پێ گوتم: من و (رۆجەر) ئەمرۆ لەوپەڕی خۆشەویستیداین، بەڵام جاران پەیوەندییەکەمان بەم شێوەیە نەبو. ئێمە بە بەردەوامی خەریکی کێشمەکێش بوین. زۆر شت هەبو ئەو ئەنجامی دەدان کە ئازاری منیان دەدا. کاتێك کتێبی (پیاوان لە مەریخەوە هاتوون)م خوێندەوە (جۆن گرەی) هاتۆتە ماڵەوە و بەدوامانەوەیە. ئەوەی ئێمە وامان دەزانی وتووێژی دووقۆڵیی خۆمانە لەو کتێبەدا نوسرابو. من وام دەزانی تەنیا هەر ئێمە واین. کە زانیمان خەڵکی دیکەش ئەزمونی هاوشێوەیان هەبووە

زۆرمان پێخۆش بو. کە بۆمان دەرکەوت زۆر کەپڵی دیکەیش هەمان ئەم ئەزمونانەی ئێمەیان هەیە لە لۆمەکردنی یەکتری رزگاربوین.

**کە بۆمان دەرکەوت زۆر کەپڵی دیکەیش**

**هەمان ئەم ئەزمونانەی**

**ئێمەیان هەیە لە لۆمەکردنی یەکتری رزگاربوین.**

ئیتر کە کێشەیەك سەری هەڵدەدا، وەکو جاران نەدەگەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە (رۆجەر) گیروگرفتی هەیە. ئیتر هەستم بە بێدەسەلاتی نەدەکرد لە بەدەستهێنانی ئەو شتانەی دەمویست و لەوەش گرنگتر وازم لەوە هێنا هەڵسوکەوتەکانی (رۆجەر) بەوە لێك بدەمەوە کە خۆشی ناوێم.

## فێربونی دورکەوتنەوە

(نێڵ) نوسی: (ستیوارت)ی مێردم بە سروشت کەسێکی زۆر بێدەنگە. زۆر مەریخیە. هەرگیز نەمدەتوانی بزانم هەستی چۆنە و ئەمەش وای لێ دەکردم زۆر بەگومان بم دەمگوت پێویستە بزانم. ئاخر چۆن بتوانین پەیوەندی بکەین کە ئەو باسی هیچ ناکات؟ چۆن بتوانم شتەکان باشتر بکەم ئەگەر نەزانم چی ئازاری دەدات؟ دەمزانی کێشەیەك هەیە و ئەگەر باسی نەکات ئەوا شتەکان بەرەو خراپتر دەچن. بە دیارە ئێمە قسەمان نەکردو شتەکان خراپتر بون.

**کاتێک هەوڵم دەدا شتەکان باشتر بکەم، خراپترم دەکردن.**

من نەمدەزانی هەوڵەکانم بۆ ئەوەی بیهێنمە قسە دەبێتە هۆی ئەوەی زیاتر و زیاتر پاشەکشە بکات. کاتێك ئەوەم خوێندەوە کە چۆن مەریخیەکان دەچنەوە ناو ئەشکەوتەکانیان، تێگەیشتم کە چۆن لە رێگەی هەوڵەکانمەوە بۆ باشترکردنی شتەکان، دۆخەکەم خراپتر کردووە. (ستیوارت) مەزاجی بەرەو باشتر دەچو. هەرکاتێك

ئـەو لـە دەرەوەی ئەشـكەوتەكەی بوایـە، ئامـادەیی زیـاتری دەردەبـڕی و زیـاتر بایـەخی پێدەدام. دەزانم بەبێ ئەم تێگەیشتنە ئێمە هێشـتا هـەر لـە شـەڕو چـەلەحانێدا دەبـوین لەگەڵ یەكتریدا.

## فێربونی گوێگرتن

(چـەك) وتـی: فێربـونی گـوێگرتن گـرنگترین دیـاری بـو كـە لـە كتێبـی (ژنـان لـە ڤینۆسەوە هاتوون) فێری بـوم. مـن هەمیشـە ئـەوەم دەبیست كـە مـن پەیوەندیكـەرێكی باشـم. لەراسـتیدا، مـن پەیوەندیكـەرێكی پیشـەییم – پیشـەكەم ئەوەیـە لـە كـەناڵێكی رادیـۆیی چـاوپێكەوتن ئـەنجام دەدەم. ئـەی بۆچـی هاوسـەرەكەم ئەوەنـدە لـێم تورەیـە؟ بۆچی چیتر قسەم لەگەڵ ناكات؟



**هەمو جارێک کە هاوسەرەکەم دەیویست قسە بکات،**
**بە خستنەڕوی چارەسەر قسەکانم پێدەبڕی.**

مـن وەكو زۆربەی پیاوان دڵم هەر لای چارەسـەرەكردنی كێشـەكە بـو. هـەمو جارێـك كە هاوسـەرەكەم باسـی ئـەو شـتەی بكردایـە كـە ئـازاری دەدا، بـە خسـتنەڕوی چارەسـەر قسەكانم پێ دەبـڕی. هـەوڵم دەدا بیركردنـەوەكانی بـۆ روون بكەمـەوەو هەسـتەكانی بـۆ راسـت بكەمـەوەو لـە رێگـەی خسـتنەرووی چارەسـەرەوە كێشـەكانی لـەكۆڵ بكەمـەوە. هـەوڵم دەدا هـەمو كێشـەكانی بـۆ چارەسـەر بكـەم جگـە لـەو كێشـەیەی كـە بەراسـتی دەیویست چارەسەربكرێت. ئەو تەنیا پێویستی بەوەبو بەس گوێی لێ بگرم.

چـەند سـاڵێك بـە بـەردەوامی داوای ئـەوەی لێ دەكـردم، بـەڵام هـەرگیز بەراسـتی لـە مەبەستەكەی تێنەگەیشتبوم. وام دەزانی كە دەڵێت بەس گوێ بگرە، مەبەسـتی ئەوەیـە چاوەڕێ بكەم تا قسەكانی تەواو دەكات ئینجا چارەسەرەكانمی بۆ بخەمەرو. ئێستا تـەنیا گوێ دەگرم؛ خۆم دەپارێزم لەوەی چارەسەری پێشكەش بكەم. خۆشبەختانە ئێستا ئـەو هەست دەكات (گوێی لێ دەگیرێت).

## ئەنجامدانی کەمتر و عاشق بوون

(مارج) وتی: کە هاوڕێکانم بە بەردەوامی داوایان لێ دەکردم کتێبەکانی (جۆن گرەی) بخوێنمەوە، لەسەرەتادا بەرهەڵستیم کرد. نەمدەویست پیاوێك ئامۆژگاریم بکات کە دەبێت چی دیکە ئەنجام بدەم بۆ ئەوەی پەیوەندییەکەم باشتربکەم. بۆچی دەبێت هەر ژنان هەمو شتێك بکەن بۆ ئەوەی پەیوەندییەکە باشتر بکەن؟ من ماندو بوبوم لە ئەنجامدانی کاری دیکە و دەمویست (فیلیپ)ی هاوسەرم شتێك ئەنجام بدات. هەرچەندە حەزم لێ نەبو، بەڵام دەرمانەکەم بەکارهێنا.

وازم لەوە هێنا شتی زیاتری بۆ بکەم و وازم لە داواکردنی شتی زیاتریش لەو هێنا. لەبری ئەوەی خووبەمە سەر گۆڕینی ئەو. مانگی دوای ئەوەم تەرخانکرد بۆ ئەنجامدانی ئەو کارانەی حەزیان پێدەکەم.



**وازم لەوە هێنا چێشتخانەکەی ماڵەوە پاک بکەمەوەو پاش ماوەیەک کە تەواو دۆخی چێشتخانەکە شپرزە بو دەستی کرد بە پاککردنەوەی.**

وازم لەوە هێنا هەوڵ بدەم بیهێنمە قسە. ئیتر ئەو پرسیاری لە من دەکرد کە چۆن ڕۆژەکەم بەسەربردووە. وازم لەوە هێنا چێشتخانەکەی ماڵەوە پاك بکەمەوەو پاش ماوەیەك کە تەواو دۆخی چێشتخانەکە شپرزە بو دەستی کرد بە پاککردنەوەی. وازم لەوە هێنا پرسیاری لێ بکەم بڵێم دەنگوباست چۆنە. دوای چەند هەفتەیەك ئیتر خۆی باسی ڕۆژەکەی خۆی بۆ دەکردم. جلەکانی کە لەسەر زەوییەکە بڵاوی کردبونەوە هەڵمنەدەگرتنەوەو دواجار خۆی کۆی دەکردنەوە. هەرچەندە من زۆرم حەز بەمە نەبو، بەڵام کارێکی سەرکەوتو بو.

**پێزانین بە کارەکانی وەک نهێنییەکی سیحراویی خۆشەویستیی وابو؛ دەستبەجێ ئاسودە و ئارام دەبو.**

دەستم کرد بە دەربڕینی پێزانینی خۆم بەرامبەر هەمو ئەو کارانەی دەیکردن. هەرچەندە نەمدەویست چاوەڕوان ببم تاکو موبەقەکە بە تەواوی پیس و شپرزە دەبێت بۆ ئەوەی ئەو پاکی بکاتەوە، بەڵام ئەوەم کرد. کاتێك شتەکانی پاك دەکردەوە، زەردەخەنەیەکم بۆ دەکردو دەمگوت بەراستی زۆر باشە. پێزانین بە کارەکانی وەك نهێنییەکی سیحراویی خۆشەویستیی وابو؛ دەستبەجێ ئاسودە و ئارام دەبو. هەرگیز نەمدەزانی کارەکە هێندە ئاسانە. ئینجا دووبارە هەستم بەوەکردەوە کە عاشق بومەتەوە.

بەڵێ، من پێویست بو گۆڕانێك بکەم، بەڵام نەمدەزانی ئەمەیە. پێویست بو واز لەوە بهێنم کە بمەوێت شتەکان بە شێوەیەکی دیاریکراو بڕۆن بەڕێوە. بەڵێ، ماڵەکەمان بڵاوە. بەڵێ، ئێستاش ناوبەناو ماوەی چەند ڕۆژێك لە ئەشکەوتەکەیدا دەمێنێتەوە. بەڵام کە دێتەوە دەرێ، ئێمە لە خۆشەویستیداین و ئەمەش بۆ من مەسەلەیەکی زۆر بەنرخە.

بەڵێ، کارێکی سەختە کە خۆم بپارێزم لەوەی هەمو شتەکان من ئەنجامی بدەم و پاشان لەو پەست ببم کە یارمەتیم نادات و بایەخم پێ نادات؛ بەڵام کاتێك کە بۆم دەرکەوت ئەمە ڕێگەیەکی سەرکەوتووەو بەمەش لە جاران زیاتر یەکتریمان خۆش دەوێت، زۆر بەلامەوە ئاسانتر بو. بەراستی شایانی ئەو نرخەیە.

## دەستپێکردنەوە لەسەرەتاوە

(جودی) ئەمەی گێڕایەوە: بە هەردوکمان ئەمە شەشەم هاوسەرگیرییمانە. هەریەکەمان سێجار هاوسەرگیرییمان کردووە. سێ ڕۆژی دیکە تەمەنم دەبێت بە پەنجاودو ساڵ. ئەگەر دوای ئەم هەمو ماوەیە پاش ئەم هەمو کارە باشترین پەیوەندییم نەبێت، ئیتر پەیوەندییم بۆچییە؟ حەزدەکەم بە تەنیا بم وەك لەوەی لە پەیوەندییەکدا بم کە تیایدا دەستبەرداری مافەکانم ببم. کاتێك من و (کێن) هاوسەرگیرییمان کرد، (کێن) تەمەنی پەنجاویەك ساڵ بو. پێگەیشتو بوین! گەورەبوین! هاوسەرگیرییمان کرد بۆ ئەوەی بگەینە ئاستێکی تری پابەندبون لە ژیانی هەردوکماندا؛ بە هاوسەرگیری کردن ئاستی ئەو پابەندییەمان بەروونی دەرخست کە هەردوکمان دەمانویست هەمانبێت و نەمان بێت!

شتەکە بەم شێوەیە بو:

دوای پانزە ساڵ هاوسەرگیری یەکەمم بە جیابونەوە کۆتایی هات. هیچ زانیارییەکم نەبو کە چۆن دەتوانم پەیوەندییەکی باشم هەبێت. دایك و باوکم بە بەردەوامی خەریکی شەڕکردن بون و هیچ ڕێزێکیان بۆ یەکتر نیشان نەدەدا. وامدەزانی لەبەرئەوەی کە من کەسێکی ئاقڵم دەبێت شتێکی جیاواز بکەم، بەڵام هەمو ئەوانە ڕویاندایەوە.

دوای جیابونەوەکە، لە ماوەی ساڵونیوێکدا هاوسەرگیرییەکی دیکەم کرد. پیاوێکی باش بو بەڵام دیسان هاوسەرگیرییەکە سەرکەوتو نەبو. لانی کەم ئەمجارە پانزە ساڵ نەمامەوە. هەرچەندە سەرم لێ شێوابو بەڵام بەتەواوی بۆم روون بۆوە کە من نازانم چۆن ئەم کارە بەڕێوە ببەم.

**کاتێک وازم لە پێدانی ئامۆژگاری هێنا، ئیتر دەستی کرد بەوەی گوێم لێ بگرێت.**

پاشان (کێن) هاتە ژیانمەوەو هەمو شتێك گۆڕا. ئێمە لەکاتی بەشداریکردن لە سیمینارێکی (جۆن گرەی)دا لەبارەی پەیوەندیکردنەوە یەکترمان بینی. بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا دەستم کرد بە تێگەیشتن لە پیاوان و لەوەی چی ڕودەدات لە پەیوەندییەکانمدا. دەستم کرد بەوەی فێربم چۆن قسە لەگەڵ پیاواندا بکەم بە شێوەیەك کە گوێم لێ بگرن. کە وازم لەوە هێنا بەردەوام ئامۆژگاری یارمەتیدەرانەی بدەمێ، دەستی کرد بەوەی گوێم لێ بگرێت. ئێستا دە ساڵە بەیەکەوە بە خۆشی دەژین و دەشزانم لەبەرچی.

ئێمە پەیوەندی بەیەکەوە دەکەین و دەزانین چۆن ڕێز لە یەکتر بگرین وەك دوو ڕەگەزی جیاواز. ئێمە دەزانین ئەو جیاوازییانە چۆن کاردەکەن. چیتر وا بیرناکەمەوە پێویستە (کێن) هەمیشە تێم بگات. هەندێك جار خۆیشم لە خۆم تێناگەم، کەواتە چۆن دەبێت چاوەڕوانی ئەوە لە مەریخیـیەك بکەم؟ کاتێك ئەو گوێم لێ دەگرێت و هەوڵ دەدات لێم تێبگات، بەراستی هەوڵدانەکەی بەهەند وەردەگرم.

**وام دەزانی ئەگەر خۆشی بوێم، ئەوا بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەتوانێت لە ڕێگەی پەیوەندیکردنەوە پێمەوە ببەسترێتەوە.**

پێش (کێن) چاوەڕوانی ئەوەم لە پیاو دەکرد کە تەنیا گوێ بگرێت و تێبگات. وام دەزانی ئەگەر خۆشی بوێم، ئەوا بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەتوانێت لە ڕێگەی پەیوەندیکردنەوە پێمەوە ببەسترێتەوە. من نەمدەزانی کە پیاوان لە ڕێگەی کردارەوە دەبەسترێنەوە.

کاتێك (کێن) کە شتێکم بۆ دەکات و من پێزانینی بۆ دەردەبڕم، ئەوکاتە هەست دەکات بەستراوەتەوە (connected). گوێگرتنی ناکارا وا دەکات پیاو هەست بکات هیچ کارێك ناکات کە یارمەتیدەر بێت. بە ئاسانی بێزار دەبێت، سەبری نامێنێت، خەیاڵی دەڕوات یاخود بایەخی بە بابەتەکە نامێنێت. لە ڕێگەی دەربڕینی پێزانینەکانمەوە بۆ (کێن)، بیری دەکەوێتەوە کە ئەو کەسێکی یارمەتیدەرە. ئەمە نەك تەنیا دڵخۆشتری دەکات، بەڵکو بیری منیش دەخاتەوە کە پشتگیرییەکانی بەبێ منەت تەماشا نەکەم.

هەروەها چاوەڕوانی ئەوەش لەخۆم ناکەم کە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی هەمو جیاوازییەکانمان قبوڵ بکەم و لە ئامێزیان بگرم. دیارە هەندێك جار ئەمە سەختە، بەڵام ئێستا لە خۆم ڕازیم هەیە کە مامەڵە لەگەڵ کەسێکدا دەکەم کە زۆر لە خۆم جیاوازە!

**هەرچەندە ئێمە لەیەکتری جیاوازین، بەڵام ئەو هەر بە ئەندازەی من لەسەر هەقە" من پێویستم بەوە نییە چاکبکرێمەوە، دیارە ئەویش پێویستی پێ نییە.**

لەیادبونی ئەوەی کە پیاوان لە مەریخەوە هاتون و ژنان لە ڤینۆسەوە یارمەتیمان دەدات ڕێز لە جیاوازییەکانمان بگرین و هەوڵ نەدەین ئەو جیاوازییانە پشتگوێ بخەین یاخود ڕەتیان بکەینەوە. من و (کێن) بە ساڵانی هەشتاکاندا تێپەڕیوین کە مۆدەی ئەو ماوەیە وابو ژنان و پیاوان ڕێك وەکو یەکتری بن. ئێستا ئێمە دەزانین کە ئەوە ڕاست

نی‌یە: ئێمە بۆمان دەرکەوتووە کە بە هیچ جۆرێك هاوشێوە نین. بەڵام فێری ئەوەش بوین کە کەسمان لەوی دیکەمان باشتر نی‌یە. هەرچەندە ئێمە لەیەکتری جیاوازین، بەڵام ئەو هەر بە ئەندازەی من لەسەر هەقە؛ من پێویستم بەوە نی‌یە چاکبکرێمەوە، دیارە ئەویش پێویستی پێ نی‌یە.

بوونی ئەو جیاوازییانە پێویستن. نەك تەنیا هەر بۆ منداڵ دروستکردن بکەین، بەڵکو لەروی دیکەیشەوە. لەم ساڵانەدا کە تێپەڕین، ئێمە زۆر لە سروشتە جیاوازەکانمان دوورکەوتوینەتەوە. لە ڕێگەی خۆشویستنی (کێن)ەوە بەو شێوەیەی کە هەیە، من گەڕاومەتەوە بۆ خودە عاشق و قبوڵکەرەکەم. ئەمە پەنجاو دو ساڵی خایاندووە و من زۆر سوپاسگوزارم.

## گەشەکردن پێکەوە لە خۆشەویستی‌دا

(فرێد) ئەم چیرۆکەی بۆ گێڕامەوە: بەردەوام گوێم لە ناوی (ماری رایت) دەبو. پێیان دەگوتم ئەو کارەکەی (جۆن گرەی) ئەنجام داوە. دەچێتە دڵتەوە. من ئەوکاتە بەشدارییم دەکرد لە سیمینارەکانی (جۆن گرەی)داو کارەکانیم لە چارەسەری دەرونیدا بەکاردەهێنا، کەواتە رێی تێدەچو (ماری) بچێتە دڵمەوە. بەڵام نەمدەویست وا زوو دوای جیابونەوەکەم دووبارە پەیوەندی دروست بکەمەوە — توشی خەمۆکی نەبوبوم، باش بوم، بەڵام حەزم لە پەیوەندی دروستکردن نەبو.

بە ناچاری لە یەکێك لە سیمینارەکاندا (ماری)م بینی. سیمینارەکە سەماکردنیشی تیادابو من سەمام لەگەڵدا کرد، لەبیرمە لە خەیاڵی خۆمدا دەمگوت بەڕاستی ئەم ژنە دەچێتە دڵمەوە، بەڵام هیچ خۆشەویستییەك نەبو. ئەو جوان بو، سەرنجڕاکێش بو، زیرەك بو هەروەها لایەنی رۆحیی هەبو — بەڵام من هەستم بە خۆشەویستی نەکرد. ئەو هەستەم بۆ دروست نەبو تا ساڵونیوێك دوای ئەو جارە کە دووبارە بینیمەوە. (ماری) لە ئاهەنگێکدابو کە منیش بۆی دەچوم. دیارە ئەو جوانترین و سەرنجڕاکێشترین کەسی ناو ئاهەنگەکە بو. بیستوپێنج خولەکی رێك قسەم لەگەڵدا کرد، ژمارەکەم لێ وەرگرت و دو هەفتە دواتر تەلەفۆنم بۆ کردو داوام لێ کرد لەگەڵ من

و کچەکانمدا بێت بۆ کۆنسێرتێکی (بیلی جوێل). کۆنسێرتێکی زۆرخۆش بو.

ئەو شەوە پێم گوت: (ماری) تۆ چویتە دڵمەوەو دەمەوێت دووبارە لەگەڵتدا بچمەوە دەرێ. بەراستی چێژم لەوەبینی کە ئەمشەو لەگەڵ تۆدا بوم.

ئەو گوتی: منیش، بەڵام پێویستە شتێکی گرنگت پێ بڵێم. من دەبێت زۆر زۆر بە هێواشی بچمە ناو پەیوەندییەوە. شێوازی من وابووە کە خۆم فڕێ داوەتە ناوی و بەبێ ئەوەی بە خۆم بزانم لێی کشاومەتەوە، ئێستا لە هەوڵێکی سەختدام بۆ ئەوەی ئەمە دووبارە نەکەمەوە. دەمەوێت تۆ هەر لەسەرەتاوە بزانیت کە من ناتوانم پەیوەندی جەستەییت لەگەڵدا بکەم.

پرسیم: ئەوە واتای چییە؟ ئەگەر نەتوانم دەستەکانت بگرم یاخود نەتوانم باوەشت پیادا بکەم، ئەوە شتێکی سەختە. بەڵام ئەگەر باسی ئەوە دەکەیت کە یەکسەر پەیوەندی سێکسی و رۆمانسی نەکەین، من بەلامەوە ئاسایی‌یە

وتی (مەبەستم ئەوەیە. تێگەیشتیت؟)



دوای باوەشێك لەیەك جیابوینەوەو پێکەنین و بەمەش یەکەم ژوانمان کۆتایی هات.

شتەکان بە هێواشی رویاندا، بەڵام بەهەرحاڵ شێوازێکیان وەرگرت. پاش چەند مانگێکی کەم، من لەگەڵ (ماری) و کچەکەم و یەکێك لە هاورێکانی کچەکەمدا چوین بۆ شاری یاری. من لەو کاتەدا بەشێوەیەکی سەرپێیی دوو ژنی دیکەیشم دەبینی، بەڵام دوای ئەو گەشتە بۆم دەرکەوت کە (ماری) بەڕاستی ئەوکەسەیە کە دەمەوێت لەگەڵیدا بم. هەرچەندە چوار پێنج مانگ دوای ئەوە بۆ یەکەمجار ماچی ناودەممان کرد. ماوەیەك دوای ئەوە پەیوەندییەکەمان بو بە جەستەیی. ساڵێك دوای ئەوە ئیتر پێکەوە دەژیاین.

کتێبەکەی (جۆن) یەکێکە لە گرنگترین ئەو شتانەی من و (ماری) تیایدا هاوبەشین. چیرۆکێکی راستەقینەی پێشتر و پاشتر هەیە: کە ئەو پەیوەندییانەیە کە پێش بەشداریکردن لە سیمینارەکانی (جۆن)دا ئەنجامم داون و ئەم پەیوەندییەشە لەگەڵ (ماری) کە دوای ئەو بەشداریکردنە ئەنجامم داوە. لە (ماری)دا ئەوە دەبینم کە سەرکەوتنەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئامۆژگاریی پیاو ناکات لە خستنەڕوی ئامۆژگاری نەخوازراو چەند یارمەتی داوە.

(ماری) کە مامۆستای پۆلی چوارە، راهاتووە کە بە کوڕە بچکۆلەکان بڵێت چۆن

بژین، بەڵام من کە مەریخی‌یەکی نمونـەییم رقـم لەوەیـە وام پـێ بڵێن. مـن دەبیـنم کـە (ماری) لە (جۆن)ەوە فێر بووە بپرسێت بزانێت ئایا ئامادەم گوێ بگرم یان نا، ئەم کـارە زۆر دەنرخێنم. لەراستیدا چەند شتێکیشی فێـری کچەکانم کـردووە کـە یارمـەتی داون لەو رووەوە باشتر لێم تێبگەن.

**رقم لەوەیە پێم بگوترێت کە دەبێت چی بکەم، بۆیە کاتێک (ماری) دەیپرسی ئایا ئامادەم گوێی لێ بگرم، پێزانینم هەبو بۆی.**

بەلای خۆمەوە، تاڕادەیەکی زۆر بەنرخترین کلیل بۆ سـەرکەوتنی پەیوەندییەکـەمان ئەوەیـە کـە فێربوم چۆن گوێ بۆ هەسـتەکانی (مـاری) بگـرم و پوچـەڵیان نەکەمـەوە. هەرچەندە من چارەسەرکار بوم، کتێبەکەی (جـۆن) ئـەو راستییەی تێـدا دەرخستم کـە زۆر بابەت هـەن لـەم رووەوە فێریـان بـبم. پیـاوان ماوەیـەکی ئەوەنـدە زۆر هەسـتەکانی ژنیان بێ نـرخ کردووە کە تەنانـەت ئێستا خۆشیان بـاوەڕ ناکـەن وا دەکـەن. دەڵێن (بـە دڵنیایی‌یەوە، رەنگـە تـۆ بـەمجۆرە هەسـت بکـەیت، بـەڵام وەرە بـا لـۆجیکی بـین، باشـە؟) بۆئەوەی ببم بەو گوێگرە باشەی کە وامـدەزانی خـۆم وام، دەبـو فێـری ئـەوەبم گـوێ لـە هەستەکانی ژن بگرم بەبێ ئەوەی هەستەکانیان رەت بکەمەوە.

**پیاوان هەستەکانی ژنان بە کەم دەگرن.**

**دەبو من فێر بم لەبری رەتکردنەوە لەو هەستانە بگرم.**

هۆکارێکی کلتوری هەیە ئەوە رون دەکاتـەوە کـە بۆچـی پیـاوان هەسـتەکانی ژن رەت دەکەنـەوە: نێرینـە هـەر لـە مناڵییـەوە لـەناو پیاوانـدا گـەورەبون. ئـەوان وا دەزانـن کـە کوڕان لە کچان باشـترن — زیـرەکترن، بـەهێزترن، و .. تـاد — لـە نێرینـە گـەورەترەکان، باوك، مام و خاڵ، باپیرە و براکانیان دەبیسـتن کـە چۆن حساب بـۆ ژنـان و هەسـتەکانی ژنان ناکەن. بۆیە کوڕان کە گەورە دەبـن هـیچ تێگەیشتنێك یـاخود پێزانینێکی قوڵیـان

نی‌یە بۆ ژیریی مێینە.

وەکو زۆربەی پیاوان، پێش ئەوەی بەشداری سیمینارەکانی (جۆن) بکەم، هەرگیز نەمدەزانی کە بێ ڕێزییەکی شاراوەم هەیە بەرامبەر بە ژنو بیرو بۆچونەکانی ژن. وابزانم لەراستیدا پێش ناسینی (ماری) توانیومە بە جدی گوێ لە ژنان بگرم، بەلآم (ماری) یەکەم ژن بو (جگە لە کچەکانم) کە توانیم لەگەڵیدا ئەم ئاستە نوێیەی گوێگرتنی لەگەڵدا پەیڕەو بکەم. لە ڕێگەی کارەکەمەوە وەك چارەسەرکارێکی دەرونی ئەوەم بۆ دەرکەوتووە کە تاکو پیاو گوێ لە ژن نەگرێت، ژنەکە واز لەو تورەیی و بێڕیزییە ناهێنێت کە بەرامبەر بە پیاو هەیەتی. واتە بەردەوام، ژنان لەودیو دەرگا داخراوەکانەوە باسی ئەوە دەکەن کە پیاوان چەند بێ فەڕن. بەلآم بە گوێگرتنی راستەقینە، متمانە گەشە دەکات. بەلای (ماری)یەوە گوێگرتنەکانم زۆر گرنگ بون بۆی، بەلآم ئەمە بۆ خۆشم زۆر گرنگ بو. من و (ماری) هەستی هاوبەشییمان لەلا دروست بو.

بۆیە، کارەکەی (جۆن) دەرگای بەروی متمانەدا کردەوە. بەم جۆرە ژنان دەتوانن سەبارەت بە ئەشکەوتەکە ئاسودە بن: متمانەی ئەوەیان دەبێت کە پیاوەکە دێتەوە دەرێ. هەروەها ئەوەشم بۆ دەرکەوت کە بۆ من چەند گرنگە بەرامبەر بەو کارانەی دەیکەم بنرخێندرێم. لە هاوسەرگیرییەکەی پێشومدا، هەستم دەکرد کە ژنەکەی یەکەمم بەبێ منەت لەو شتانەی دەڕوانی کە بۆم دەکردن و هەرگیز پێزانینی دەرنەدەبڕی، بەلآم کارەکەی (جۆن) تیشکی خستەسەر ئەو لایەنە تایبەتەی پەیوەندی: کە نرخاندن بەلای پیاوەوە چەند گرنگە. بۆ نمونە، کاتێك (ماری) دەڵێت (خۆشم دەوێیت) من بەدڵنیایی‌یەوە زۆرم پێخۆشە ئەوە ببیستم، بەلآم کە دەڵێت (ئازیزەکەم، بەراستی هەستێکی زۆر خۆشم هەیە کە بلیتەکانت بەدەست هێنا)، یاخود (سوپاس کە خۆڵەکەت بردە دەرەوە)، یاخود (بەڕاستی پێم جوانە کە چەند بە سەختی هەوڵ دەدەیت ببیت بە باوکێکی باش) و ئەو جۆرە پێزانینیانە کار لە ناخ دەکەن و زۆر بەنرخن بۆ من.

وانەکان زۆر سەرەتایین، من هەمیشە لە کارەکەمدا بەکاریان دەهێنم. تێگەیشتن لە جیاوازییەکانی نێوان ژن و پیاو متمانە دروست دەکات، ئەمەش ئاسایشێکی زۆر دابین دەکات. لەوێدایە کە خۆشەویستی دەتوانێت گەشە بکات. ئەمەش هەر گەشەی کردو

بوژایەوە. من و (ماری) لە ساڵی ١٩٩٤ هاوسەرگیریمان کرد. (جۆن) و (بۆنی) بەشداری ئاهەنگەکەیان کردین.

## یەکەمجار (من) بدۆزەرەوە ئینجا (ئێمە)

ئەمە گێڕانەوەی چیرۆکەکەیە لەلایەن (ماری)یەوە. من ئالودەبوی رۆمانسم، یاخود ئالودەبوی رۆمانس بوم. باشترین هاوڕێی کوڕم لە تەمەنی پێنج ساڵیدا هەبو و لەوکاتە نەوەستاوم، هەرگیز بێ پەیوەندی نەبوم، تاکو چەند ساڵێك دوای هاوسەرگیری سێیەمم، ئەوکاتە تەمەنم چلودو ساڵ بو. من لە خێزانێکی ئالودەبووەوە هاتبوم — دایکم ئالودەی خواردنەوەی مەی بو، دوو براشم بەهۆی مەی و مادەی هۆشبەرەوە لەناوچون. کاتێك کە سێ هاوسەرگیریم تێپەڕاند، بۆم دەرکەوت کە منیش ئالودەبونێکم هەیە. من ئالودەی مەی و مادەی هۆشبەر نەبوم — بەڵکو ئالودەی هاوسەرگیری بوم. بەشداریکردنم لە سیمینارەکانی (جۆن) یارمەتی دام ئەمەم بۆ دەربکەوێت.

---

**من ئالودەبوی رۆمانسم، یاخود ئالودەبوی رۆمانس بوم.**
**باشترین هاوڕێی کوڕم لە تەمەنی پێنج ساڵیدا هەبو و**
**لەوکاتە نەوەستاوم، هەرگیز بێ پەیوەندی نەبوم، تاکو چەند ساڵێك**
**دوای هاوسەرگیری سێیەمم، ئەوکاتە تەمەنم چلودو ساڵ بو.**

---

دوای ئەم دەرکەوتنە گەورەیە، دواجار بە خۆمم گوت، پەیوەندییەك لەگەڵ خۆمدا دروست دەکەم بۆ ئەوەی بزانم من کێم. بەشە خانووەکەی خۆمم کڕی، بە تەنیا گەشتێکم کرد بۆ باشوری خۆرئاوا، و بە ناو مۆسیقادا گەڕام بۆ ئەوەی بزانم حەزم لە چیە. بەردەوام بە خۆمم دەگوت (من ئەمەم. من حەزم لەم شتەیە. حەزم لەم شتە نییە. من ئەم شتە قبوڵ ناکەم. من رەنگە ئەم شتە قبوڵ بکەم)؛ من دووبارە کەوتمەوە ناو خۆشەویستی، بەڵام ئەمە یەکەمجار بو ئاشقی خۆم ببم.

هەر لەم کاتی تەنیاییەمدا، گوێم لە ناوی (فرێد کلێینەر) دەبو خەڵك وایدەزانی

یەکتریمان بە دڵە. (من ئەوم بەدڵ نییە، من پەیوەندی ناکەم)، وام پێدەگوتن. بەڵام بەردەوام گوێم لە ناوی دەبو. رەنگە بینیبێتیشم. ئینجا جارێکیان چوین بۆ ئاهەنگێك و لەوێ (فرێد کلێینەر)ی لێ بو. هات بۆلام و دەستی کرد بە قسەکردن، زۆر دڵخۆشکەر بو. داوای ژمارەکەی لێ کردم و چەند هەفتەیەك دوای ئەوە تەلەفۆنی بۆ کردم داوەتی کردم بۆ کۆنسێرتێك.

لەسەر رێگای کۆنسێرتەکە، من یەکسەر بە ئاگادارکردنەوەیەك دەستم پێکرد. گوتم "دەمەوێ بزانیت من سێجار هاوسەرگیریم کردووە. من نازانم چۆن پەیوەندی بکەم، بەڵام دەزانم کە ئەم یەکەیان زۆر بە جیاواز دەکەم."

باوەشی پیاکردم و من بەردەوام بوم لە قسەکردن. وتم "نازانم کەی دەتوانم ماچت بکەم، ئەگەر بیکەم. من لە سەرزەمینێکی تەواو نوێدام" ماچ خاڵی لاوازی من بو. (فرێد) گوتی "دەتوانم باوەشت پیادا بکەم؟"

باوەش قەیناکە. بەڵام ماچ – هەر جارێك کە ماچی کەسێك بکەم ئیتر بایەخی پێدەدەم، ئیتر کۆنترۆڵم نامێنێت. بەمشێوەیە من توشی ئالودە بون بوم بە رۆمانسەوەو سەرزەمینێکی خەیاڵییم دروست کردووە.

(فرێد) گوتی "ئەوە زۆرباشە"؛ ئەو شەوە کاتێکی زۆر خۆشمان لە کۆنسێرتەکە بەسەربرد. شێوازێك دروست بو. پێنج مانگ‌ونیوی یەکممان بە چونە دەرەوە بۆ نانخواردن یان بۆ سینەما بەسەربرد. دوای ئەوە (فرێد) بە پیاسە دەیبردم بۆ ماڵەکەم و لەوێ باوەشمان بەیەکدا دەکرد، ئینجا پێدەکەنین، بەڵام هێشتا ئامادە نەبوم بۆ پەیوەندی سێکسی. (فرێد) زۆر بەشکۆ بو. هەرگیز پاڵی پێوەنەنام؛ رێزی لێ دەگرتم. کارەکەی (جۆن)ی بە باشی دەزانی و شتی سیحراوی پێدەکرد.

**من ناچاری نەکەوتمە ناو خۆشەویستییەوە، ئەوەش نەبو**
**کە بەهۆی چاوەڕوانییە رۆمانسییە ناواقیعییەکانمەوە**
**کە دووبارە بەدی نەهاتنەوە، بێ ئومێد بوبم.**

(فرێد) یەکەم پیاو بو کە کاتی تەرخان دەکرد گوێم لێ بگرێت. ئەمە یارمەتی دام پەیوەندییم لەگەڵ خۆمدا بمێنێت. من ناچاری نەکەوتمە

نـــاو خۆشەویســـتییەوە، ئـــەوەش نـــەبو کـــە بـــەهۆی چـــاوەڕوانییە ڕۆمانســـییە ناواقیعییەکانمـەوە کـە دووبـارە بـەدی نەهاتنـەوە، بـێ ئومێـد بـوبم. بـە دڵنیـایـیـەوە هەورازو نشێوی خۆمان توش بووە، بـەڵام تێمـان پەڕانـدن. فێـری ئـەوە بـوم کـە پیـاوان پێویسـتیان بـە بۆشـایی خۆیـان هەیـە بـۆ ئـەوەی شـتەکان چارەسـەر بکـەن و منـیش پێویستە ڕێگە بدەم شتەکان روبدەن. (فرێد) فێربوبو کە ڕێگەم بـدات قسـەبکەم و ئـەو تەنیا گوێ بگرێت.

ئێسـتا دەتـوانم تەماشـای ئالودەبونـە ڕۆمانسـییەکەم بکـەم و تێبگـەم کـە بۆچـی رویداوە. ئەوە فەنتازیایەك بو کە من دەمویست خۆشەویستی بـە چ جۆرێـك بێـت. مـن ئەوەندە پێویستم بەوە بو کەسێك خۆشی بوێم کە دەبوم بەو شتەی پیاوەکە دەیویست ببم و خۆمم لەدەست دەدا. ئەوەندە لەگەڵ پیاوەکەدا (هاوسەرەکەم) دەبوم بە یـەك کـە چیتر بیرم لەوە نـەدەکردەوە کـە پێویسـتییەکانی خـۆم کامانـەن و مـن کـێم و پێویسـتم بەچییە و تەنانەت حـەزم لەچـییـە. تـەنیا دەچـومە نـاو ژیـانی پیاوەکـەوەو دەبـوم بـە پاشکۆی. دواجار، بۆم دەرکەوت کە کەسـێکی ناشـادم و ئـەو شـتانە بەدەسـت نـاهێنم کـە پێویستمن.

بەڵام لەگەڵ (فرێـد)! ئێمـە کـاتێکی زۆرخـۆش پێکـەوە بەسـەر دەبـەین، مـن لەگـەڵ ئەودا بەتەواوی خۆمم. من (ماری رایت)م، مامۆستام و ژنی (فرێد کلێینەر)م.

من بە دڵنیاییەوە دەزانم کە دەتوانم بەبێ (فرێد) بژیم، بـەبێ ئـەو هەڵبسوڕێم و بـەبێ ئـەو ژیـانێکی زۆر ئاسـودە بـژیم. بـەڵام نامـەوێت وا بکـەم. مـن بـە بڕیـارو هەڵبژاردنی خۆم لەگەڵ (فرێد) دەژیم نەك لە ناچارییدا.

تێگەیشتن لەوەی کە ئێمە چۆن لەیەکتری جیـاوازین یارمـەتیم دەدات هـەمو ڕۆژێـك (فرێد) هەڵبژێرم. هەست ناکەم کێشەیەکم هەبێت. پێویستم بەوە نـیـیـە خـۆم بگـۆڕم بۆ ئەوەی ئەو خۆشی بوێم. ئـەو جیاوازییـەکانی منـی قبوڵـە. هـەوڵ دەدات هەسـتەکانم پشتڕاست بکاتەوەو لایەنە باشـەکانم ببینێـت. چیـتر هەسـت ناکـەم کـە ناچـارم هەمیشـە هەمو چاوەڕوانییەکانی بهێنمە دی بۆ ئەوەی خۆشی بوێم.

ژیانم بە شێوەیەکی هەڵبژێردراو لەگەڵ (فرێـد)دا زۆر ڕۆمانسـیترە لـە ژیـانم لەگـەڵ

هاوسەرەکانی پێشومدا لەسەر بنەمای ئەو فەنتازیا نەخۆش و ئالودەکەر و رۆمانسییەی کە پێشتر هەمبو. لەو سەردەمەدا، من خۆمم نەبو. ئێستا (فرێد)م هەیە و خۆشمم هەیە. ئێستا هەردوکمانم هەیە.

## موعجیزەی تێگەیشتن

بە بۆچونی (سوو)، کتێبی (پیاوان لە مەریخەوە هاتوون و ژنان لە ڤینۆسەوە) بەراستی وەڵامی دوعاکانی من بو. من پێویستم بە موعجیزەیەك هەبو لە هاوسەرگیرییەکەمدا. من گەیشتبومە ئەو خاڵەی کە زۆر بیرم لە جیابونەوە دەکردەوە — بەڵام نەمدەویست ئەو کارە بکەم، لەپێناوی منداڵەکانماندا. بەجۆرێك لە جۆرەکان وام هەست دەکرد کە (وەڵامەکە) بەرێوەیە — واش بو!



**من گەیشتبومە ئەو خاڵەی کە زۆر بیرم لە جیابونەوە دەکردەوە بەڵام نەمدەویست ئەو کارە بکەم، لەپێناوی منداڵەکانماندا.**

من و (ریچارد) بیستو چوار ساڵ بو هاوسەرگیرییمان کردبو، پێنج منداڵمان هەبو، تەمەنیان لە ١٦ بۆ ٢٢ ساڵ بو. لە ماوەی بیستوچوار ساڵی رابردودا هەوڵ و وزەیەکی ئەوەندە زۆرمان تەرخان کردووە لە پەروەردەکردنی منداڵەکانماندا بۆ ئەوەی ببنە کەسی باش و بەرپرسیار کە وا دەزانم کێشەکانی خۆتیان خستە پەراوێزەوە. ئێستاش کچەکەمان لە کۆلێجە و دو کوڕەکەشمان خەریکن قۆناغی ئامادەیی تەواو بکەن — بۆیە ئێستا هەست دەکەم کە ئیتر خەریکە کارەکەمان کۆتایی دێت. ئێستا ئیتر زیاتر فۆکەس دەکەینە سەر یەکتر بۆئەوەی لەگەڵ یەکتردا هەڵبکەین.

کێشەی سەرەکیمان لە بیستوچوار ساڵ رابردودا بریتی بو لە نەبونی پەیوەندیکردن لە نێوانماندا. هەرکاتێك بمویستایە هەستەکانی خۆم سەبارەت بە کێشەیەکی منداڵەکان باس بکەم، (ریچ) دەکەوتە حاڵەتی بەرگرییەوە و هێرشی دەکردە سەرم کە ئەو کێشەیە خەتای منە — زۆرجار دەیگوت هۆکارەکە ئەوەیە کە من دیسپلینم نییە بۆیان.

هەرگیز گوێی لێنەگرتوم بەبێ ئەوەی هەوڵ بدات من یان کێشەکە (چارەسەر)

بکات. هەمو جارێك گفتوگۆکە بە گریانی من کۆتایی دەهات و خۆزگەم دەخواست هەرگیز هەوڵم نەدایە قسەی بۆ بکەم. ئەعسابێکی خراپی هەبو کە زو هەڵدەچو و قسەی ناخۆشیشی پێدەگوتم.

بەڵام دوای ئەوەی لەگەڵمدا کتێبەکەی تۆی خوێندەوە، ئێستا ئیتر لێم تێدەگات و ئەعسابیشی باشتر بووە. بەهۆی ئەو شتانەوە کە تۆ لە کتێبەکەتدا لەبارەی ژنانەوە گوتوتن، کە من رێك بەوشێوەیەم، بۆ یەکەم جار لە ژیانیدا بۆی دەرکەوتووە کە من کەسێکی ئاساییم. ئێستا دەتوانم بیرو هەستی خۆمی بۆ باس بکەم بەبێ ئەوەی لێم تورە ببێت.

---

**بۆ یەکەم جار لە ژیانیدا بۆی دەرکەوتووە کە من کەسێکی ئاساییم.**

---

لە بەشی (٥)دا باسی ئەوە دەکەیت کە پیاو پێویستە بیری نەچێت کە کاتێك ژن سکاڵا لەبارەی کێشەیەکەوە دەکات مەرج نییە مەبەستی لۆمەکردنی پیاوەکە بێت؛ بەڵکو، ژنەکە هەوڵ دەدات بە باسکردنی کێشەکان بێزارییەکەی برەوێنێتەوە. تۆ دەڵێیت کە ژنان باسی هەستەکانیان دەکەن بۆ ئەوەیە ئاسودە ببن، بەڵام کە پیاوان دەچنەوە ناو ئەشکەوتەکانیانەوە، بۆ ئەوەیە بە تەنیا کێشەکانیان چارەسەر بکەن. کە بۆمان دەرکەوت ئەوی ئێمە دەیکەین ئاساییە، هاوسەرگیرییەکەمان رووی لە چاکیی کرد.

لەگەڵ خوێندنەوەی هەر بەشێکدا، ئێمە دڵخۆش دەبووین بەرامبەر بەو گۆڕانکارییانەی کە لە ژیانماندا رویان دەدا. ئەوی راستی بێت هەمو رۆژێك کە لە کارەکەم دەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە، (ریچ) دادەنیشت لەگەڵمداو پرسیاری رۆژەکەی لێ دەکردم — و گوێی لە قسەکانم دەگرت! ئەمە شتێك بو کە پێویستم پێی بو، ئەویش لە کتێبەکەوە فێری بوبو.

لە بەشی (١٠)دا کە باسی ئەوە دەکەیت چۆن ژن "خاڵ تۆمار دەکات" و چۆن شتە بچوکەکانی پیاو بە ئەندازەی شتە گەورەکان خاڵیان بۆ دەنوسرێت، ئەمە بەلای منەوە زۆر راست بو. من ئەم هەمو ساڵە بەبێ ئەوەی بە خۆم بزانم لە مێشکی خۆمدا خاڵم

تۆمـار دەکـرد. بـەردەوام مـن خـاڵێکی زۆر لـەپێش (ریـچ)ەوە بـوم، هەمیشـە ئەنجامەکـە نایەکسـان بـو — کـە ئەمـە وای لێ دەکـردم زۆر لێی بـڕەنجێم. مـن هەمیشـە پـەتای دڵڕەنجـانم هـەبو. واو! مـن ئەوەنـدە بێـزارییم بەرامبـەر بـەو لـەدڵ گرتبـو کـە پەیوەندییەکەمانی ژەهراوی کردبو، رۆژێکیـان پـێم گـوت؛ مـن خۆشەویستیم هەیـە بـۆ تۆ، بەڵام وەکو کەسێك چیتر ناچیتە دڵمـەوە. مـن ئـیتر خۆشـم نەدەویست بـەهۆی ئـەو هەمو بێزاریی و پەستییەوە کە لە دڵمدا کەڵەکە بوبون.

**من ئیتر خۆشم نەدەویست بەهۆی ئەو هەمو بێزاریی و پەستییەوە کە لە دڵمدا کەڵەکە بوبون.**

چـەند مـانگێکی کـەم دوای ئـەوە، کتێبەکـەی تۆمـان بـە دیـاری لـە (جـۆن)ی بـرای (ریـچ)ەوە بـە دیـاری بـۆ هـات کـە لـە کالیفۆرنیـا دەژی. ئـەو بیستبوی کـە تـۆ بـاس لـە پەیوەندییـەکان دەکـەیت و حـەزی لـە قسەکانت کردبـو، ئێمـە بـەم جـۆرە کتێبـەکانی تۆمان لەم سەرزەمینی بەستەڵەکەی باکور بەدەست گەیشت (ئەو بەیانی‌یە پلـەی گـەرما ٢٠ پلە ژێر سفر بو!).

دوای خوێندنەوەی کتێبەکەی تۆ، نامەیـەکی خۆشەویستی نـۆ لاپـەڕەییم بـۆ (ریـچ) نوسی هەمو هەستەکانم بـۆ خستەسـەر کاغـەز. فێـری ئـەوەبوم کـە لـە رێگـەی نوسـینی هەستە نەرینییەکانمەوە ئەو هەستانە هێزەکەیان نامێنـێ و بەمـەش رێگـە بـە هەسـتی ئەرێنی دەدەن دەربکەوێت. من بەشی (پاشکۆ)شـم بـۆ نوسـی بـۆ وەڵامـەکان، کـە تـۆ لـە بەشی یانزەدا باست کردووە — نوسـینی وەڵام بـۆ نامەکـەم کـە لـە (ریـچ)م دەخواسـت — ئەمە زۆرترین یارمەتی بە من گەیاند. لێرەدا بو کـە چارەسـەرەکە بـە راسـتی لـە دڵمـدا دەستی پێکرد.

**نامەی لێبوردنکردنە زۆر جوانەکەی برینە سۆزدارییەکان ساڕێژ دەکردەوە.**

کاتێك کـە نامەکـەی خـۆم و وەڵامەکـەی خـۆیم نیشـانی (ریـچ) دا، بـە نامەیـەك بـە

داوای لێبوردنێکی زۆر جوانەوە وەڵامی دایەوە کە ئەمیش یارمەتیدەربو لە چارەسەرکردنی هەستە ئازاردراوەکانمدا. لەمەوە شتی نوێ لەبارەی یەکترەوە فێربوین. من بۆم دەرکەوت کە باشترین ڕێگە بۆ ئەوەی پەیوەندی لەگەڵدا دروست بکەم ئەوەیە نامەی خۆشەویستیی بۆ بنوسم. تەنانەت ئێستاش، ئەگەر بەراستی بێزاربم و بمەوێت هەستەکانمی بۆ دەرببڕم، بە زۆری بەسەرمدا دەشکێتەوە؛ بۆیە ئێستا دەزانم کە باشترین ڕێگە ئەوەیە کە ئەو هەستانە بخەمە سەر کاغەز. بەبێ ئەم ڕێگەیە، ڕەنگە بەهۆی پەستی و خەمۆکییەوە بمردمایە، کە بەوە توشم بوبو کە هەرکاتێك دەمویست قسەی لەگەڵدا بکەم هەستەکانمی بریندار دەکرد.

لە ماوەی دوو ساڵی ڕابردودا پەیوەندییەکانمان زۆر گەشەیان کردووە، لەوکاتەوە کە کتێبەکەی تۆمان خوێندۆتەوە. ئێستا باشتر لە یەکتری دەگەین. لەوەش تێدەگەین کە هەریەکەمان بۆچی ئێستا ئاوا هەڵسوکەوت دەکەین. من بڕوام وایە کە ڕاستییەکانی ناو کتێبەکەی تۆ هاوسەرگیرییەکەمانی پاراست، لەبەرئەوە من هەتا هەتایە سوپاسگوزارم. ئێستاش خاڵەکان لە ماڵی ئێمە لە جاران یەکسانترە، چونکە (ریچ) جلەکان دەشوات، هەندێك جار خواردن ئامادە دەکات و لە زۆر لەو شتە بچوکانەشدا یارمەتیم دەدات کە گۆڕانێکی گەورە لە پەیوەندییە هاوسەرگیرییەکەماندا دروست دەکەن. دیارە ئێستاش هەوراز و نشیومان دێتە ڕێگە، بەڵام لەسەر ڕێگەی چاکبونەوەداین و دوبارە هیوایەك هەیە سەبارەت بە هاوسەرگیرییەکەمان.

# ٣

## پیاوان و ئەشکەوتەکانیان



بێگومان گرنگترین و بەسودترین زانیاری دەربارەی مەریخییەکان بۆ ڤینۆسییەکان ئەوەیە کە لە پیاوان و لە ئەشکەوتەکانیان تێبگەن. ئەم تێگەیشتن لەوەی کە رەنگە پیاو هاوسەرەکەی خۆش بوێت بەلاَم هەندێك جار نەیەوێت کاتی لەگەڵدا بەرێتە سەر – بەلای زۆرینەوە شتێکی زۆر چاوەڕواننەکراوە و بەگشتی مەسەلەیەکە زۆر نامۆیە بە سروشتی ئەوان.

کاتێك ژن لە خۆشەویستیدا دەبێت لەگەڵ پیاوەکەیدا، چاوەڕوانی ئەوە دەکات کە کات پێکەوە ببەنە سەرو پێکەوە قسەو باس بکەن. تەنانەت ئەوکاتەش کە ژنەکە هەست بە نیگەرانی دەکات، هێشتا چاوەڕوانی ئەوە دەکات وردەکارییەکانی ئەو رۆژەی بۆ ئەو پیاوە بگێڕێتەوە کە خۆشی دەوێت. بەلای ژنەوە، قسەکردن و باسکردنی شتەکان یارمەتی دەدات شتەکان چارەسەر بکات و بارەکەی ئەو رۆژە لەکۆڵ بکاتەوە؛ ئەمە هۆگریی دروست دەکات و بە کورتییەکەی وا دەکات ژنەکە هەستێکی باشتری بۆ دروست ببێت.

بەلای ژنەکەوە پەیوەندیکردن لەگەڵ هاوبەشەکەی و وەرگرتنی پشتگیری لێی یەکێکە لە سودە هەرە سەرەکییەکانی پەیوەندی. هەستێکی خۆشە کاتێك ئەو کەسەی کە بایەخت پێدەدات لەوەش تێبگات کە پیایدا تێدەپەڕیت. ڤینۆسییەکە تا زیاتر پیاوەکەی خۆش بوێت، دەیەوێت زیاتر شتی بۆ باس بکات.

بەلای ڤینۆسییەوە زۆر ناخۆش و بێ ئومێدکەرە کاتێك مەریخییە خۆشەویستەکەی دەگەڕێتەوە ماڵێ هیچی نەبێت بۆ ئەمی باس بکات. کاتێك ژنەکە لێی دەپرسێت ئایا هیچ شتێك هەیە نارەحەتی کردبێت، پیاوەکە دەڵێت "هیچ نییە." ژنەکە تێناگات کە مانای ئەم قسەیە ئەوەیە کە "من بۆ ماوەیەك لە ئەشکەوتەکەمدا دەبم، حەزدەکەم ئێستا

قسە نەکەم. پاش ماوەیەك دێمەوە دەرێ."

**کاتێک پیاو دەکشێتەوە بۆ ناو ئەشکەوتەکەی، ژن بە هەڵە ئەم رووداوە دەهێنێتە سەر خۆی و هەست دەکات رەتکراوەتەوە.**

بەبێ تێگەیشتن لەوەی کە پیاوان لە مەریخەوە هاتون، ژن ناتوانێت ئەم بابەتە نەهێنێتە سەرخۆی. ژنەکە وا دادەنێت کە دەبێت پیاوەکە خۆشی نەوێت بۆیە نایەوێت شتی بۆ باس بکات. تێگەیشتن لە ئەشکەوتەکەی پیاو و قبوڵکردنی مەسەلەیەکی زۆر گرنگە بۆ هەمو ئەو ژنانە کە لەگەڵ پیاواندا دەژین، یاخود بە نیازن رۆژێك لەگەڵیاندا بژین. هەرچەندە ئەمە هێندەش ئاسان نییە، بەڵام ئەم نمونانە رەنگە کەمێك ئاسانی بکەن.



## هێشتا خۆشی دەوێم

(جانێت) گوتی: کاتێ هاورێییەکی کچم لێم تورە دەبێت ئیتر قسەم لەگەڵدا ناکات. لەسەر هەسارەی ڤینۆس، قسە لەگەڵ نەکردن ئاشکراترین و راشکاوترین هێمایە بۆ ئەوەی کە کێشەیەکی گەورە لە پەیوەندییەکەدا هەیە. بۆیە کاتێك (کارلۆس)ی هاوسەرم نایەوێت قسە بکات، ئیتر دەشڵەژێم. نیگەران دەبم بەرامبەر بەو شتانەی ئەنجامم داون. دوای ئەوەی ماوەیەك نارەحەت دەبم تورە دەبم ئینجا تورەیی و بێزاریی دامدەگرێت لەوەی کە ئەو رەتم دەکاتەوە بەبێ ئەوەی من هیچ شتێکی هەڵەم کردبێت. پاشان هەست بە ئازار دەکەم.

زۆر بە رونتر بیڵێم، کاتێك دەچووە ئەشکەوتەکەیەوە، بەلامەوە شتێکی زۆر سەخت بو. چونکە دەمویست قسەبکەم و ئەو ئامادە نەبو، یان لەدەستم بێزار دەبو یان خەیاڵی دەڕۆیشت. کاتێك پێم دەگوت کە گوێم لێ ناگرێت، شتەکان خراپتر دەبون و دەکەوتینە مشتومڕەوە.

هەرچەندە ئەو پێی دەگوتم کە هیچ کێشەیەك لە گۆڕێدا نییە، بەڵام من بڕوام پێنەدەکرد. چونکە من خۆم دەمزانی هەرکاتێك کە نەمویستایە قسە بکەم مانای وابو

کێشـەیەك هەیـە. خوێندنەوەکـەم دەربـارەی ئەشـکەوتەکە گـۆڕانێکی گـەورەی دروسـت کرد. ئاسودەبوم کە زانیم هێشتا خۆشی دەوێم. نەمدەتوانی بڕوا بکەم کـە ئـەو خۆشـی دەوێم تا ئەوکاتەی فێربوم کە تەنیا هـەر ئـەو وانـی‌یە، بـەڵکو هـەمو مەریخییـەکان بـە بەردەوامی دەچنە ئەشکەوتەکانیانەوە.

**نەمدەتوانی بڕوا بکەم کە ئەو خۆشی دەوێم تا ئەوکاتەی فێربوم کە تەنیا هەر ئەو وانی‌یە، بەڵکو هەمو مەریخییەکان بە بەردەوامی دەچنە ئەشکەوتەکانیانەوە.**

زۆر ئاسودەبوم کە بـۆم دەرکـەوت ئـەوە مانـای وانـی‌یـە منـی کـەمتر خـۆش دەوێت. پـێش ئـەم تێگەیشـتنە، وام هەسـت دەکـرد کـە خۆشەویسـتی ئـەو بـۆ مـن کـەمترە لـە خۆشەویستییەکەی من بۆ ئەو. ئێستا تـەنیا چاوەڕێی دەکـەم لـە ئەشـکەوتەکەی بێتـە دەرەوە ئینجا قسـە دەکـەم. بـە زۆری لەوکاتـەدا زیـاتر بایـەخ بـە قسـەکانم دەدات. زۆر خۆشحاڵ و سوپاسگوزارم کە دواجار لە مەریخی‌یەکەم تێگەیشتم.

## خەتـای من نی‌یە

(ئانا) بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە: کاتێك ئەو لـە ئەشـکەوتەکەیدا دەبـو، هەمیشـە مـن وام هەسـت دەکـرد کـە هەڵەیـەکم کـردووە؛ وەمـدەزانی خـەتای منـە. ئەمـە وای دەکـرد هەست بە تاوان بکەم و پاشان هەوڵم دەدا زیاتر دڵخۆشـی بکـەم. هەرچـی‌یـەکم بـەبیردا هات ئەنجامم دا. هەوڵم دەدا ماڵەکە بە تەواوی پـاك بکەمـەوە، ئـەو خواردنانـە لێ بنـێم کـە ئـەو حـەزی لێیـە، داوای هـیچ شـتێکی زیـاترم نـەدەکرد، پاشـان کاتێـك کـە دوبـارە دەچووەوە بۆ ناو ئەشکەوتەکەی خۆی و زۆر لێیان پەست دەبوم.

**کاتێک ئەو لە ئەشکەوتەکەیدا دەبو، هەمیشە من وام هەست دەکرد کە هەڵەیەکم کردووە" وەمدەزانی خەتای منە.**

لـــــەوە دەچـــــو هەرچـی‌یـەکم کـردووە و دەیکـەم بێ‌سودن. پاش ماوەیەك ئیتر ئەو بڕوایەم لـەلا دروسـت دەبـو خـەتای مـن بـووە کـە شـوم بـە

پیاوێکی هەڵە کردووە. بەڵام ئێستا ئاسودەم کە بۆم دەرکەوتووە من شوم بە مەریخیـیەك کـردووە. لـەبری ئـەوەی شـتی زیـاتری بـۆ بکـەم ئـەو ماوەیـەی لـە ئەشـکەوتەکەیدایە، پشتگوێی دەخەم و ئەو شتم بۆ دەکات. پێم سەیرە کە لێم زویر و تورە نییە. پێی خۆشە کە بۆشاییـیەکی زۆری دەدەمێ. حەز دەکەم زۆربەی جار زیاتر لێوەی نزیك بم بەڵام بە دڵنیاییـیەوە ئەمە پەستی دەکات.

ئەو قسەیە هیوام پێدەبەخشێت کە دەڵێت هەتا پیاو زیاتر پێبگات کەمتر پێویستی بە ئەشکەوتەکەی دەبێت و تا ژنیش زیاتر پێبگات سەربەخۆتر دەبێت و کەمتر (موحتاج) دەبێت کاتێك پیاوەکە لە ئەشکەوتەکەیدایە. وا دەزانم لەو ماوەیەدا کە کەمتر نارەحەت ببم، بە بونی پیاوەکە لە ئەشکەوتەکەیدا، ئەو کەمتر لە ئەشکەوتەکەیدا دەمێنێتەوە.

---

**لەو ماوەیەدا کە کەمتر نارەحەت ببم، بە بونی پیاوەکە لە ئەشکەوتەکەیدا، ئەو کەمتر لە ئەشکەوتەکەیدا دەمێنێتەوە.**

---

## ڤینۆسی‌یەکانیش پێویستیان بە ئەشکەوتە!

(لـۆرا) بۆچـونێکی سەرنجڕاکێشـی هـەبو: کاتێـك فێربـوم ئـەوە قبـوڵ بکـەم کـە هاوبەشەکەم پێویستی بەوەیە ماوەیەك لە ئەشکەوتەکەیدا بەسەربەرێت نەك تەنیا ئـارامی کەوتـە پەیوەندییەکەمانـەوە بـەڵکو شـتێکی زۆر گرنگیشـی دەربـارەی خـۆم فێرکـردم. کاتێك مۆڵەتی ئـەوەم پێبەخشی خۆیشم لەوکاتانـەدا هـەر خـۆی خـەریکی خـۆی بێـت، مۆڵەتی ئـەوەم بەدەست هێنا کە خۆیشم بایەخ بە خۆم بدەم. کە لە کارەکەمەوە دەگەڕامەوە ماڵەوە لەبری ئەوەی خۆم فڕێ بدەمە نـاو ئەرکەکانی ماڵەوە یاخود هەوڵ بدەم ببمە ژنـە خۆشەویستەکە، هەنـدێك کاتم بـە خـۆم دەبەخشی. بۆم دەرکەوت مادام ئەو دەتوانێت وا بکات، کەواتە منیش دەتوانم.

هەرچەندە ئەشکەوتەکەی من لەوی ئەو جیاوازە، بەڵام هێشتا ئـەو ماوەیـە کـاتێکی تایبەتـە بـۆ خـۆم نـەك بـۆ کەسـی دیکـە. کاتێـك ئـەو گۆڤارێـك دەخوێنێتـەوە یـاخود تەماشـای تەلـەفزیۆن دەکـات، حەزدەکـەم بچـم پیاسـەیەك بکـەم یـاخود خـەریکی

باخچـەکەم بـبم. ئەمـە ئەشـکەوتەکەی منـە. سـەیر لەوەدایـە، کـە فێربـوم کـاتی ئەشکەوتەکەی ئەو قبوڵ بکەم، دەستم کرد بە بەخشینی ئەو شتە بە خـۆم کە هەمیشە دەمخواست و حەزم لێ بو بەڵام هەرگیز بە خۆمم نەبەخشیبو.

**کاتێک مۆڵەتی ئەوەم پێبەخشی خۆیشم لەوکاتانەدا**
**هەر خۆی خەریکی خۆی بێت، مۆڵەتی ئەوەم بەدەست هێنا**
**کە خۆیشم بایەخ بە خۆم بدەم.**

پاشـکۆ: مـن هێشـتا ڤینۆسـیم، لەگـەڵ ئەوەشـدا؛ کاتێـک کـە لـە دەرەوەی ئەشکەوتەکانماندایین، حەزدەکەم قسەی بۆ بکەم. ئەویش گوێم بۆ دەگرێت.



## پێویستم بە بۆشایی زیاترە

(کـارۆڵ) گۆشـە نیگایـەکی دیکـەی هەیـە: پاشەکشـەکردن بـۆ نـاو ئەشـکەوت شـتێکی پێکەنیناوییـە. مـن لـە (چـاك) زیـاتر ئـەم کـارە دەکـەم. مـن لـەو زیـاتر پێویسـتم بـە تەنیایی‌یە. لەکاتێکدا کە ئەو چەندین ساڵ هاوسەرگیری کردبو، من خۆشـترین سـاڵەکانم بـە تـەنیایی بەسـەربردووە. لەوەدەچێت مـن پێویسـتم بـە بۆشـایی زیـاتر هـەبێت. وا دەزانم ئـەو پـێی ناخۆشـە کـە مـن هەنـدێك جـار دەچمە نـاو ئەشـکەوتەکەمەوە، بـەڵام فێربوم دڵنیای بکەمەوە لەوەی کە دێمەوە دەرێ. هەتا لەیادم بێت ئەو شتانە بنـرخێنم کە بۆ منیان دەکات، چونە ئەشکەوت نابێتە کێشە: دەزانێت کە ئەگەر من ئامادەییم بـۆ خۆی و بۆ پێویستییەکانی نەبێت لەبەرئەوەی کە لە ئەشکەوتەکەمدام، بە دڵنیایی‌یـەوە ئەوە ناگەیەنێت کە من هەمو ئەو شتانە نانرخێنم کە پێمی دەبەخشێت.

## دەگەڕێمەوە

(جـەین) باسـی ئـەوەی کـرد کـە چـۆن خـۆی و هاوسـەرەکەی هەڵسـوکەوتەکەیان گۆڕیوە: دوای خوێندنەوەی کتێبەکانت، (پات)ی هاوسەرم یەك گۆڕانی بچوکی کـرد کـە کاریگـەری گـەورەی لەسـەر پەیوەندییەکـەمان دروسـت کـرد. لـەوە تێگەیشـت کـە کـاتی

چونە ناو ئەشکەوتەکەی بەلای منەوە سەختە.

بۆی دەرکەوت کە پاشەکشەکردنەکەی ئەو بۆ من مەسەلەیەکی سەختە. من پێم ئاساییە کار بکەم بۆ ئەوەی رێگەی بدەم بچێتەوە ناو ئەشکەوتەکەی، بەمەرجێك ئەویش بزانێت کە بەلای منەوە سەختەو هەندێك جار ئازاریشم دەدات. کاتێك هەست دەکەم پشتگوێ خراوم و بایەخم پێنەدراوە، ئەشکەوتەکەی وەکو بەرگرییەك یاخود بیانویەك بەکارناهێنێت. لەبری ئەوە هەوڵ دەدات گوێ بگرێت و پاشان بەرنامە بۆ کاتێکی تایبەت بۆ هەردوکمان دادەنێت.

**کاتێک هەست دەکەم پشتگوێ خراوم و بایەخم پێنەدراوە، ئەشکەوتەکەی وەکو بەرگرییەک یاخود بیانویەک بەکارناهێنێت.**

پێویست ناکات ئەو واز لە ئەشکەوتەکەی بهێنێت، بەلام شتێکی جوانە کە دەری دەخات بایەخ بە هەستەکانم دەدات. رێگەیەکی دیکە کە نیشانم دەدات بایەخم پێدەدات ئەوەیە کە دەڵێت "تەنیا پێویستم بەوەیە بچم کەمێك ئوتومبیل لێ بخورم. کەمێکی دیکە دەگەرێمەوە"؛ ئەم وتەیە (دەگەرێمەوە) شتەکە زۆر ئاسان دەکات و لەبەرئەمە خۆشم دەوێت.

## گەرانەوە لە ئەشکەوتەکە

(تۆم) گومانەکەی لە خۆی ئاشکراکرد: من سیوشەش ساڵە هاوسەرگیریم کردووە و هەمیشە پێم وابووە کە کێشەیەکم هەیە. کاتێك بیستم پیاوانی دیکەش ئەشکەوتیان هەیە، کەوتمە گریان. وامدەزانی کە هەرگیز ناتوانم بەراستی ژنێکم خۆش بوێت. هەمیشە وام هەست کردووە کە هاوسەرەکەم نائومێد دەکەم. هەوڵم داوە ببمە کەسێکی ئامادەو مشوخۆر، بەلام لە ناخدا هەرگیز هەستم بەوە نەکردووە. هەرگیز کەس پێی نەگوتووم کە ئاساییە لەو کاتانەدا بچمە ئەشکەوتەکەمەوە.

ئێستاش کاتێك کە هەست بە گەرمی و خۆشەویستی ناکەم، تەنیا واز لە هەوڵدان

دەهێنم و لەبری ئەوە ئەو شتانە دەکەم کە حەز بە ئەنجامدانیان دەکەم. زۆرجار تەنیا سەرخەوێك دەشکێنم یاخود لەگەڵ هاوڕێیەکمدا دەچم بۆ سینەما. ئینجا رۆژی دواتر، تەلیسمەکە دەشکێت و دوبارە دەگەڕێمەوە بۆسەر خۆشویستنی ژنەکەم. کاتێك کە پاشەکشە دەکەم، ئەویش ئەوەندە هەست بە نائومێدی ناکات. ئەمە دەبێتە مایەی خۆشحاڵییم.

**ئەگەر بۆ ماوەی چەند رۆژێک لە ئەشکەوتەکەمدا بمێنمەوە، لە گەڕانەوەمدا چەپکێک گوڵی بۆ دەهێنمەوە یاخود موبەقەکەی بۆ پاک دەکەمەوە.**

من زۆر سوپاسگوزارم کە ئێستا لێم تێدەگات ئەگەرچی زۆریشی حەز لێ نییە. دوای ئەوەی کە بەشێوەیەکی کاتی دەچمە ئەشکەوتەکەمەوە، هەمیشە هەوڵ دەدەم کاتێك کە دەگەڕێمەوە شتێکی تایبەت بکەم یاخود کەمێك سۆز دەربڕم. ئەگەر بۆ ماوەی چەند رۆژێك لە ئەشکەوتەکەمدا بمێنمەوە، لە گەڕانەوەمدا چەپکێك گوڵی بۆ دەهێنمەوە یاخود موبەقەکەی بۆ پاك دەکەمەوە. ئەنجامدانی شتی بچوك گۆڕانی گەورە دروست دەکات و هەروەها ئەوەشی بۆ دەردەخات کە دووبارە هەستە پڕ لە خۆشەویستییەکەم بەدەست هێناوەتەوە.

## بەسەربردنی کاتێکی خۆش لەگەڵ ئەشکەوتەکە

(کایلی) چارەسەرێکی زیرەکانەی هەبو: پێش ئەوەی بەشداری ووۆرك شۆپەکەی (جۆن) بکەم، دەچومە ناو ئەشکەوتی مێردەکەمەوە و دەمویست بیرازێنمەوە. وێنەی خۆمی تیادا هەڵبواسم، تەوقەو بۆیەی نینۆکەکانمی تیادا بڵاوبکەمەوە. هەرچەندە نەمدەزانی، ئەمە پێشێلکردنێکی زۆر گەورەیە لە وڵاتی مەریخیەکاندا، و (گاری) بەردەوام کەرەسەکانی منی لە ئەشکەوتەکەی دەهێنایە دەرەوە. بۆچی ئەو نایەوێت بە گەوهەری ژنە خۆشەویستەکەی دەورە بدرێت؟ دەمویست ئەوە بزانم. بە تێگەیشتن لە ئەشکەوتەکە، توانیم واز بهێنم و ئەو شتەی پێ ببەخشم کە پێویستی پێیەتی.

(گاری) دڵخۆش بو کە زانی نەك هەر ئاساییە بۆشاییەك بە دەوری خۆیدا دروست بکات، بەڵکو ناچاریشە. رۆژێکیان هاتمەوەماڵەوەو گوێم لە دەنگێکی بەرزی (درێل) بو لە پشتەوەی خانووەکەمانەوە دەهات. بینیم کێلونێکی کردووە بە دەرگای ئەو ژوورەوە کە دەیەوێت وەکو

ئەشکەوت بەکاری بهێنێت. ئێستا بەڕاستی دەتوانێت دەرگا لەسەر خۆی دابخات.

**(گاری) دڵخۆش بو کە زانی نەک هەر ئاساییە بۆشاییەک**
**بە دەوری خۆیدا دروست بکات، بەڵکو ناچاریشە.**

لە دیوی دەرەوەی دەرگاکەدا گۆریلایەکی گەورەی ناشیرینم هەڵواسیوە لە شێوەی ئامێری زەنگی دەرگادایە. هەرکاتێك کە پەنجە بە دوگمەکەدا دەنێیت، چاوە سورەکانی گۆریلاکە دادەگیرسێن، دەمی دەکرێتەوە و دەنگی نەڕەی لێوە دێت. (گاری) ئامرازەکانی منی هەڵدابووە دەرەوە، بەڵام گۆریلاکەی پێخۆش بو. هەردوکمان تێگەیشتین. کەمێك گاڵتەمان بە مەسەلەی بیرۆکەی ئەشکەوتەکە کردو فێری ئەوەبوم کە شتەکە نەهێنمە سەرخۆم. کە دەرگاکە داخرابێت، هەوڵ نادەم بچمە ژوورەوە.

## قبوڵکردنی ئەشکەوتەکە

(رۆز) باسی ئەوەی کرد کە چۆن لە ئەشکەوت تێگەیشتووە: پێش ئەوەی کتێبەکەی تۆ بخوێنمەوە، هەمو شتەکانم بە هەڵە ئەنجام دەدا. کە هاوسەرەکەم دەچووە ئەشکەوتەکەیەوە دەبو بە دوایدا بڕۆم. وامدەزانی کارێکی چاك دەکەم. وامدەزانی ئەوە ئەرکی منە بچمە ئەوێ و دەری بهێنمەوە و ئەگەر وا نەکەم خۆشی ناوێم.

ماوەی زیاتر لە بیست ساڵە، هەمو رێگەیەکم گرتۆتە بەر بۆ ئەوەی لە ئەشکەوتەکەی بیهێنمە دەرەوە. دینامیتم بەکارهێناوە بۆ ئەوەی بچمە ژوورەوە. بەراستی من ئەشکەوتبەزێن بوم!

بەڵام کاتێك تەپوتۆزەکە دەڕەوینەوە، چاوم بە ناو ئەشکەوتەکەیدا دەگێڕاو تەماشام دەکرد لەوێ نییە. دەمبینی خەریکە تونێل لێ دەدات بۆ ئەوەی لەدەستم رابکات.

**دینامیتم بەکارهێناوە بۆ ئەوەی بچمە ژوورەوە.**
**بەراستی من ئەشکەوتبەزێن بوم!**

ئێستا رێگەی پێ دەدەم بچێتە ئەوێ. خۆی دێتەوە دەرێ. من بە رێگە سەختەکە

فێری ئەمە بوم. هەمو ئەو شتانەی دەمکردن بۆ ئەوەی لە ئەشکەوتەکە بیهێنمە دەرەوە تەنیا کێشەکەیان قوڵتر دەکردەوە. کاتێك ئەو دەچێتە ئەشکەوتەکەیەوە، من دەچم بۆ شت کڕین. هەردوکمان زۆر دڵخۆشترین. دووبارە یەکتریمان خۆش دەوێتەوە.

## ئەشکەوتە فڕیوەکان

(لینێت) ددانی بەمەدا نا: زۆرم پێ ناخۆش بو کە هەمو هەفتەیەك (کریس) بەهۆی کارەکەیەوە بەجێی دەهێشتم. کۆتایی هەفتەکەمان زۆر بە ڕۆمانسی بەسەردەبرد و ڕۆژی دوای ئەوە دەڕۆیشتەوە. من پێم ناخۆش بو چونکە وامدەزانی کە ئەو کارەکەی لە من زیاتر خۆش دەوێت. تەنانەت پێش ئەوەی کە بڕوات، بیرم دەکرد. من نارەحەت بوم بەڵام ئەو دڵخۆش و شادمان بو. نەمدەتوانی تێبگەم کە بۆچی حەزناکات کاتێکی زیاترم لەگەڵدا بەرێتە سەر.

فێربون لە بارەی جیهانی مەریخی‌یەکانەوەو لەو پێویستییەیان بۆ تەنیایی و سەربەخۆیی و سەرکێشی، یارمەتی دام شتەکە ئەوەندە نەهێنمە سەرخۆم کە دەمبینی دڵخۆشە بەوەی بەجێم دەهێڵێت. کاتێك کە لە مەسەلەی ئەشکەوتەکەی تێگەیشتم، بۆم دەرکەوت کە فڕین بە فڕۆکە ڕێگەکەی ئەوبو بۆ چونەوە ناو ئەشکەوتەکەیەوە: ئەشکەوتێکی فڕیو. ئێستاکە دەبینم دڵخۆشە بە ڕۆیشتن، دەزانم کە بەجێهێشتنی من دڵخۆش نی‌یە؛ بەڵکو بەوە دڵخۆشە کە دەچێت بۆ سەرکێشیکردن.

ئێستا لەبری ئەوەی پەست ببم کە چەند ڕۆژێك بەجێم دەهێڵێت، ئەوە دەنرخێنم کە (کات) بۆ ئەشکەوتەکەی تەرخان دەکات بۆ ئەوەی کە دەگەڕێتەوە بۆلام، بە تەواوی ئامادەیی هەبێت لەگەڵمدا.

## گۆڕینی چاوەڕوانی‌یەکان

(کریستا) ئەم ڕونکردنەوەیەی هەبو: تێگەیشتن لە پیاوان و لە ئەشکەوتەکانیان هەمو چاوەڕوانی‌یەکانی منی گۆڕی. کە دەیبینم دوورو خۆپەرێزە، ناشڵەژێم. دەزانم شتێکی کاتی‌یە. بە هەمو کاردانەوە سروشتییەکانم دەڵێم نەخێر، ئەو کاردانەوانەی کە پێم دەڵێن، خەتای منە، من شتێکی هەڵەم کردووە، ئەو خۆشی ناوێم، من بە جۆرێك

لە جۆرەکان شکستم پیٚهێناوە، یاخود وەکو جاران بایەخم پیٚ نادات.

ئێستا دەزانم مەسەلەکە هیچ پەیوەندی بە منەوە نییە بەڵکو ئەو تەنیا کارە مەریخییەکەی خۆی ئەنجام دەدات. هیچ پەوەندی بە منەوە نەبووە. تەنیا مانای ئەوەبووە کە حەز بە قسەو باسکردن ناکات و پێویستی بە کەمێك کات هەیە بۆ ئەوەی ئاسودە ببێت. ئەوکاتەی کە بۆخۆی پێویستە وەری دەگرێت بۆ ئەوەی بتوانێت ئەو خۆشەویستی و بایەخە بە من ببەخشێت کە من پێویستم پیٚیەتی.

## پیاوی خەونەکانم

(لوسی) وتی: رۆژی ٣٠ی ئایاری ١٩٩١ من پیاوی خەونەکانم بینی. ناوی (پیتەر کلارك)ە. ساڵی دوای ئەوە هاوسەرگیریمان کرد و ئێستا سیٚ کوڕمان هەیە. هێشتا عاشقی ئەوم. هەمو بەیانییەك ئەو پیاوە لەخەو خەبەرم دەکاتەوە کە پێش ئەوەی رۆژەکەی دەست پیٚبکات هەواڵی من دەپرسێت. لە کۆتایی هەمو رۆژێکی پڕ ئەرك و ماندوێتیدا، دڵخۆشین بەوەی کە دووبارە لە ئامێزی یەکتردابین. ئەو لە پێویستییە ڤینۆسییەکانی من تیٚدەگات و منیش فێری پێویستییە مەریخییەکانی ئەو بوم. ژیان ئەوکاتە شایستەیە کە ڤینۆسی و مەریخییەکان عاشقی یەکتر بن.

بەڵام بەهەشت رەنج و تێکۆشانی دەوێت. هەندێك جار شارەزاییشی پێویستە.

(پیتەر) چەندین شارەزایی تایبەتی هەیە کە من دەکەنە ڤینۆسییەکی دڵخۆش. بۆ نمونە، هاوسەرەکەم گویٚ لە یەك بە یەکی وشەکانی من دەگرێت! دەزانم، رەنگە ئێوە بڕوام پیٚ نەکەن .. ئەمە زۆر نامەریخییە! بەڵام کە دەست پیٚدەکەم، بۆ چەند خولەکێك، نیو کاتژمێر تەنانەت چەند کاتژمێرێکیش بە سەبرەوە گوێم لیٚ دەگرێت و ئاسودە دەبم و هەمو ئەو بیرکردنەوە و هەستانە بە وردەکارییەوە دەگێڕمەوە کە پیایاندا تیٚپەڕیوم. بێزار نابێت و خەیاڵی ناڕوات و کارێك ناکات هەست بکەم بەزۆر دامناوە گوێم لیٚ بگرێت. گویٚ لە هەمو شتەکان دەگرێت. هیچ ئامۆژگاری و بیرۆکەیەك ناخاتە رو. هەر لە یەکەم رۆژی پەیوەندییەکەمانەوە (پیتەر) مەریخییەکی گوێگر بووە. بۆیە بە دڵنیاییەوە دەبو عاشقی ببم!

فێربون لە بارەی ئەشکەوتەکەیەوە بە شێوەیەکی زۆر یارمەتی پەیوەندییەکەمانی دا. وا دەکات تێبگەم کە بۆچی هەندێك جار ئەوەندە ئامادەیی هەیە و جاری واش هەیە چەند رۆژێك پاشەکشە دەکات. جاران، وام هەست دەکرد لەبەر چەند هۆکارێکی تەمومژاوی من رەت دەکاتەوە.

کە چەند رۆژێك بو لە پاشەکشەدا بو، دەستم کردە ملی و لێم پرسی (ئازیزەکەم، لە ئەشکەوتەکەتدایت؟)

وتی (ئۆهـ، وابزانم)

وتم (ئاخر من لێرە هەست بە تەنیایی دەکەم)

وتی (ئۆهـ، ببورە)؛ ئینجا دوای ساتێك دوودڵی گوتی"بەڵام دەمەوێت ئەوە بزانیت کە کاتێ لە ئەشکەوتەکەمدا بوم، وێنەی تۆ لەسەر دیوارەکەی بو!"

"بەڵام دەمەوێت ئەوە بزانیت کە کاتێ لە ئەشکەوتەکەمدا بوم، وێنەی تۆ لەسەر دیوارەکەی بو!"

واو! بە روونی و بە دەنگی بەرز گوتی و رێك چووە ناو دڵە ڤینۆسیەکەمەوە! ئەوەندەی پەیوەندی بە منەوە هەبێت، ئەو دەتوانێت ماوەی هەفتەیەکیش بچێتەوە ناو ئەشکەوتەکەی، چونکە دەزانم کە لەوکاتەشدا پەیوەندییەکەمانی بەلاوە گرنگە.

## پابەندی لە کرداردا

(پام) چیرۆکێکی هەبو کە ماوەی سیوپێنجساڵو نیو درێژەی کێشاوە. ویستم باسی چیرۆکی خۆشەویستییەکەی خۆمتان بۆ بکەم لە روانگەی پابەندبوون بە کردارەوە. با سەرەتا خۆم و هاوسەرەکەمتان پێ بناسێنم. ئێمە سیوهەشت ساڵونیوە هاوسەرگیرییمان کردووە و پێنج مناڵ و پێنج نەوەمان هەیە. ئێمە سێ گۆڕانی گەورەی کارمان بەخۆوە بینیوە — لە مامۆستایەتییەوە هەتا دانانی بازرگانی ئەلکترۆنی تایبەت بە خۆمان و تاکو بونمان بە قەشە لە دو کەنیسەدا. پاش ئەوەی یەکتریمان خۆش ویست هاوسەرگیرییمان کرد، لە ساڵی ١٩٥٧دا، هاوسەرەکەم چوار قۆناغی

کۆلێجەکـەی تێپەڕانـدبو تـەنیا دو قۆنـاغی مـابو تـەواوی بکـات (بـواری خوێندنەکـەی گۆڕیبو). ئینجا زیاتر خوێندی و ماستەر و دکتۆرا و بەکالۆریۆسێکی دیکەی بەدەستهێنا.

لە ساڵانی سەرەتادا هەردوو ساڵ جارێك منالێکمان دەبو. بەڵام هەر یەکترمان خـۆش دەویست و ماینەوەو عەشق و سۆزێکی زۆرمان بـۆ یـەکتر هـەبو. بـەپێی سـتانداردەکانی ئەمڕۆ ئێمـە بـە منـاڵی هاوسـەرگیریمان کردبـو — بیسـت سـاڵ و بیسـت و دوسـاڵو نیـو. بەڵام لە واتای تەواوی وشەی "پابەندبون" تێگەیشتبوین، هەردوکمان رێك بوین لەسـەر ئەوەی دەبێت بە درێژایی هەمو تەمەن وابین، هەرچیەك روبدات. پابەنـدیی یارمـەتی داین لەگەڵ جیاوازییەکانماندا ئاشت ببینەوە.

**پابەندیی یارمەتی داین لەگەڵ جیاوازییەکانماندا ئاشت ببینەوە.**

دوای چەند ساڵێك لە هاوسەرگیری، ئەو شتە چاوەڕواننەکراوەمان بـۆ دەرکـەوت کـە ئێمە بە تەواوی دژی یەکترین. ئەو کـاك پاکوتـەمیز بـو منـیش شـازادەی پیس‌وپـۆخڵی. ئـەو حـەزی دەکـرد هـەمو شـتێك تـەواو بکـات؛ مـن کۆتـایم بـە کارەکـان نـەدەهێنا. ئـەو پێویستی بە تەنیایی بو بۆ ئەوەی پاترییەکەی شەحن بکاتەوە؛ مـن رقـم لەوەیـە زیـاتر لە کاتژمێرێك بە تەنیا بم.

هەرچـەندە ناکۆکییمـان هـەبو، پابەندبونەکـەمان بـۆ سەرخسـتنی هاوسـەرگیرییەکە یارمەتی داین چارەسەر بدۆزینـەوە. هـەمو جارێـك چارەسـەرەکە ئـەوەی دەخواسـت کـە دوبارە فێر ببین کە هاوسەرەکەمان جیاوازە لـە ئێمـە و قبـوڵی بکـەین و رێگـەی بـدەین خۆی چۆنە ئاوا هەڵسوکەوت بکات.

ئەوە ئاسودەم دەکات کە تێدەگەم کاتێك هاوسەرەکەم دەچێتە ئەشکەوتەکەیەوە بـۆ ئەوەی کێشەکانی چارەسەر بکات، پیـاوەتی خـۆی ئـەزموون دەکات، پاشەکشـەکردنەکەی هـیچ پەیوەندییـەکی بـە منـەوە نـییـە و پـاش ماوەیـەك دێتـەوە دەرەوە. تەنانـەت نوکتەشمان بۆ ئەمە دروست کردووە کـە هێمایـەك دەکـات بەخۆیـەوە لێی نوسـراوە "لـە ئەشکەوتدایە/ لە دەرەوەی ئەشکەوتە".

جارێکیان لەروی نەزانییەوە بەبێ ئەوەی داوەتکرابم چوومە ناو ئەشکەوتەکەیەوە و هەولْم دا یارمەتی بدەم کێشەیەکی کۆمپیوتەری بۆ چارەسەر بکەم. ئۆی، چ هەڵەیەك بو! بەلاّم هیچ نەبێت توانیم بزانم بۆچی ئەوەندە بەمە بێزار بو.

---

**هەرچەندە من رقم لەوەیە زیاتر لە کاتژمێرێک بە تەنیابم،**
**بەلاّم وردە وردە فێربوم کە قبوڵی بکەم کە ئەو بۆ شەحنکردنەوەی**
**پاترییەکەی پێویستیی بە تەنیاییە.**

---

فێربونی ئەوەی کە رێگە بدەم (وارێن) خۆی بێت و ئەو جیاوازییە قبوڵ بکەم خۆی لەخۆیدا پرۆسەیەکی گەشەکردنە. جیاوازییەکان هەڵە نین؛ بەڵکو ئەوانەن کە هەستو سۆز بە زیندویی دەهێڵنەوە. پێویستییەکەی (وارێن) بۆ کشانەوە مانای وانییە کە پابەند نییە بە پەیوەندییەکەمانەوە. خۆشەویستییمان بۆ یەکتری گەشەی کردووە، گوڵی گرتووە و پێگەیشتووە.

ئێمە روبەروی سەختییەکانی خوێندن و سێ گۆڕانی گەورەی کارەکەمان و پێنج منالْ و جیاوازییەکانی نێوان نێر و مێ و جیاوازییەکانی کەسێتی و ئەعسابمان و کێشەکانی دیکە بوینەتەوە. لەگەلْ ئەوەشدا کاتێك ئەو تەلەفۆنێك دەکات، من بەبێ منەت لێی ناڕوانم – هەولْ دەدەم تێی بگەیەنم کە چەند دلْخۆشم بە تەلەفۆنەکەی.

## کۆنترۆڵکردنی تورەیی

(کارۆلین) باسی پەیوەندییە گەشەکردووەکەی کرد لەگەلْ هاوسەرەکەیدا: من بیست و نۆ سالْم و ئێستا خوێندکارم. (فرانك)ی هاوسەرم سیوشەش سالە. لەوکاتەوە کە کتێبی (پیاوان لە مەریخەوە هاتون)مان خوێندۆتەوە، شێوازی پەیوەندییکردنمان گۆڕاوە. با بگەڕێینەوە بۆ کانونی دووەمی سالْی ١٩٩٤ ئەوکاتەی کە دە سالْ بو پێکەوە بوین.

من و (فرانك) ئەو هەمو سالە بەراستی یەکترییمان خۆش دەویست، بەلاّم چەند کێشەیەکی جددیمان هەبو. زۆر زوو هەڵدەچو، تورەبو، منیش زۆر رەخنەگر بوم و

داواکارییم زۆربو. لە مانگی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٩٤دا. ئێمە توشی گەورەترین و ناشرینترین و بەڵێ، توندوتیژترین شەڕی پەیوەندییەکەمان بوین. جیابوینەوە، هەرچەندە دەمانزانی کە زۆر یەکترییمان خۆش دەوێت بەڵام بە شێوەیەکی راست، پەیوەندیکردن و قسەکردنمان بە باشی ئەنجام نەدەدا. (فرانك) پەیوەندی کرد بە (کۆمەڵەی بەڕێوەبردنی تووڕەیی)ەوە و منیش سەردانی چەند چارەسەرێکم دەست پێکرد. هەشت مانگ دواتر دڵخۆش بوین بەوەی گوتمان لایەنە شکستخواردووەکەی پەیوەندییەکەمان لەناوچو. (فرانك) دەیتوانی بۆ زاڵبون بەسەر تووڕەییەکەیدا تەکنیکی جیاجیا بەکاربهێنێت – بۆ نمونە چونەدەرەوە، رێگەکانی دەربڕینی جەستەیی و .. تاد. منیش بۆم دەرکەوت کە جاران حوکمدانەکان و رەخنەگرتنەکانم بریتی بوبون لە دەربڕینی نادڵنیاییەکانم.

**ئێمە توشی گەورەترین و ناشرینترین و بەڵێ، توندوتیژترین شەڕی پەیوەندییەکەمان بوین.**

ئەو رێگە گەورانەی بەردەممان، وامان دەزانی کە پەیوەندییەکەمان بێ کەموکوڕییە. هاها! ئینجا کێشەی گەورەترمان توش دەبو .. کێشەی پەیوەندیکردن. (فرانك) بە بەردەوامی دەچووە ئەشکەوتەکەیەوە، منیش زیاتر پەست دەبوم و هەوڵم دەدا دەری بهێنمەوە. ئەم کێشە زۆر جددییانە وایانکرد گومان لەو خۆشەویستییە راستەقینەیە بکەین کە بەرامبەر یەکتر هەمانبو.

خۆشبەختانە چارەسەرکارەکەم پێشنیاری ئەوەی بۆکردم کتێبی (پیاوان لە مەریخەوە هاتون) بخوێنمەوە. من و (فرانك) بەڵێنمان دا هەر هەفتەیەك بەشێکی ئەو کتێبە بخوێنینەوە، بەڵام هەر لە بەشی یەکەمەوە ئێمە گیرۆدە بوین. ئیتر لەوکاتەوە، ژیانمان گۆڕاوە. لەوکاتەوە من رێگەی پێدەدەم لە ئەشکەوتەکەیدا بمێنێتەوە و دەزانم کە ئەو کارێك دەکات کە پێویستێتی بیکات بۆ ئەوەی بتوانین دواتر بە تێگەیشتنێکی زۆرتر و هاوسۆزییەکی زیاترەوە پێکەوە قسە بکەین. ئێمە هێشتا هەر مشتومڕمان

هەیە، بەڵام ئێستا لەو مشتومڕانە فێردەبین و گەشەیان پێ دەکەین.

کاتێـك کـە لەسـەر شـتێك هـەر بـەردەوام دەبم، (فرانـك) تێدەگـات کـە بەراسـتی پێویستم بەوەیە قسە بکەم بۆ ئەوەی بـزانم چـی ئـازارم دەدات. ئـەوەی دێتـەوە یـاد کـە ئێمە لە دو هەسارەی جیـاوازەوە هاتوین و هـەوڵ نـادات چاکم بکاتـەوە. منـیش فێـری ئەوەبوم کە (فرانك) جا بەجار پێویستی بەوە دەبێت بچێتە ئەشکەوتەکەیەوە. ئێستا دەزانم کە مەبەستی ئەوە نـیە منی خۆش ناوێت و نا ناگەڕێتەوە بۆ لام.

من ئامۆژگارییەکەی (د. گرەی)م لەبەرچاوگرتووە، بە(فرانك) دەڵێم، دەزانیـت، مـن خەریکـە سـەبرم نامێنـێ و پەسـت دەبم؛ دەچـم بـۆ شـت کـڕین یـاخود تەلـەفۆن بـۆ هاوڕێیەکم دەکەم. ئەمـەش لـەلای خۆیـەوە گوشارەکە لەسـەر (فرانـك) کـەم دەکاتـەوە. هەروەك (د. گرەی) لە یەکێك لە وانەکانیدا باسی کرد، تا زیـاتر کـار بـە تەکنیکـەکانی پەیوەندییکردنی ڕۆژانە بکەیت، کەمتر پیاوەکە دەچێتەوە نـاو ئەشکەوتەکەی و ئەگـەر بشچێتەوە، ماوەیەکی کەمتر تیایدا دەمێنێتەوە.

**"دەزانیت، من خەریکە سەبرم نامێنێت و پەست**
**دەبم، بۆیە دەچم شتێک بۆ خۆم دەکەم."**

دیارە تائێستاش ڕۆژانی ناخۆشمـان دێتـە ڕێ بـەڵام وردە وردە بـەرەو باشـی دەچـین. کەسێکی ژیر جارێکیان پێی گوتم (کـارۆلین)، تـۆ و (فرانـك) دە ساڵتان پێچـو تـا ئـەم شێوازی پەیوەندییکردنـە دروسـت بکـەن. لانـی کـەم نیـوەی ئەوکاتـە بـە خـۆت بـدە بـۆ فێربونی ئەو شێوازە و کارپێکردنی و کامڵ کردنـی؛ لەسایەی (د. گرەی)یـەوە دڵسـۆزانە فێـری ئـەوەبوین کـە چـۆن ئـەم کـارە بـە شـێوەیەکی کـاراو دڵسـۆزانە ئـەنجام بـدەین. بەراستی پێشتر نەمانـدەزانی چۆن هـەوڵ بـدەین پەیوەندییـەکی بـاش دروست بکـەین. هــەردوکمان لــە دایــك و باوکمانــەوە فێربوبــوین کــە کاتێــك نارەحــەتین بەرامبــەر هاوبەشـەکەمان هـاوار بکـەین، تـوڕە بـبین، لێی بـدەین و هـەرگیز خۆمـان لاواز نیشـان نەدەین بەوەی بە هاوبەشەکەمان بڵێین نارەحەتین یان هەست بە ئازار دەکەین.

سوپاس (د. گرەی) بۆ نوسینی ئەو کتێبە کە بە کورتی پێمان دەڵێت باش بین لەگەڵ یەکتریدا. کاتێك کە ڕێگە ڕاستەکەی پەیوەندییکردنت لە پەیوەندییدا نیشان نەدرابێت، نازانیت چۆن ئەنجامی بدەیت. ئێستا ئێمە دەزانین و زۆرجار خۆمان دەبینینەوە لەوکاتانەدا کە ئاماژە بۆ کتێبەکەی تۆ دەکەین.

## مێشکم لکێنرابو بە کارەکەوە

(ڕۆس) باسی ئەوەی کرد کە پێویستی بەوە هەبو بگۆڕێت: ژنەکەم، (برێندا) بەردەوام سکاڵای ئەوەی دەکرد کە من گوێی لێ ڕاناگرم. ڕاستی دەکرد. هەوڵم دەدا گوێ بگرم بەڵام پاش چەند خولەکێك ڕێك دەگەڕامەوە سەر بیرکردنەوە لە پڕۆژەکانی کارەکەم. مێشکم لکێندرابو بە کارەکەوە.

دوای خوێندنەوەی کتێبی (پیاوان لە مەریخەوە هاتون) بۆم دەرکەوت من ئەشکەوتم نییە. کاتێك دەگەڕامەوە ماڵەوە، مێشکم هێشتا هەر لە شوێنی کارەکەم بو. پێویستم بە جۆرە خلافاندنێك هەبو کە یارمەتیم بدات گوشارەکانی کارەکەم بەرەڵا بکەم. پێویستم بە چالاکییەکی کاتی ئەشکەوت هەبو.

**پێویستم بە جۆرە خڵافاندنێک هەبو کە یارمەتیم بدات گوشارەکانی کارەکەم بەرەڵا بکەم.**

ئێستا کە دەگەمەوە ماڵێ نزیکەی بیست خولەك پیانۆ لێ دەدەم یاخود تەنیا گوێ لە مۆسیقا دەگرم. تەنیا پێویستم بەمەیە بۆ ئەوەی پشو بدەم و کاتی تەواوکردنی ئەرکەکانم فەرامۆش بکەم. ئینجا کاری دواتر کە دەیکەم ئەوەیە (برێندا) بدۆزمەوەو بزانم دەتوانم یارمەتی بدەم یاخود قسەی لەگەڵدا دابمەزرێنم. (برێندا) ئەوە دەنرخێنێت کە من هەمو بایەخی خۆمی پێ دەدەم و کاتێك کە دەچمە ئەشکەوتەکەمەوە پێم نابڕێت.

## هۆگربونیی تەندروست

(کاندایس) بۆچونێکی لا دروست بوبو. هەمیشە خەونم بەوەوە بینیوە کە ڕۆژێك

دەكەومــە خۆشەویســتییەوە لەگــەڵ شــازادە سەرنجڕاكێشــەكەم و زیــاتر لێــك نزیــك دەبینــەوەو پێكــەوە پیردەبــین. بــەڵام لەراســتیدا، یــەك لــەدوای یــەك پیــاوم دەبینــی كــە هیچیــان وەك ئــەو وێنەیــەی مــن نــەبون. هــەمو ئــەو پیاوانــەی بینــیمن لــە هــۆگریی دەترسان. لێك نزیك دەبوینەوەو ئینجا ئەوان دوردەكەوتنەوە. لە خۆمم دەپرسی ئاخۆ كەی ئەو كەسە دەدۆزمەوە كە پێویستی بە چەند ساڵێك چارەسەر نەبێت؟

من پیاوێكم دەویست كە بیتوانیایە دڵی خۆیم بۆ بكاتەوەو ئەوەی لە دڵ و رۆحیدایە بۆم باس بكات. من دەمویست ببم بە تیپێك لەگەڵیدا. هەمو جارێ پێكەوە بین و هەست و كێشە و پێویستییەكانمان بۆ یەكتر باس بكەین. كەسێك بێت كە پشت بە من ببەستێت و منیش پشتی پێ ببەستم. كەچی هەستم دەكرد لە هەمو پەیوەندییەكانمدا دوای چەند مانگێك پیاوەكە بە جۆرێك لە جۆرەكان دەگەڕێتەوە دواوە. كە هەوڵمدەدا بیخەمە قسە، هەمیشە دەیگوت هیچ نییە باسی بكات یاخود هەستی بە بێزاریی دەكرد.

توشی سەرسوڕمانێكی زۆر بوم كە بۆم دەركەوت ئەم پیاوانە لە هۆگری نەدەترسان، پێویستیان بە چەند ساڵێك چارەسەریش نەبو — ئەوان لە مەریخەوە هاتبون. ئەمە چ گۆڕانكارییەكی بۆ دروست كردم! ئێستا كە دەبینم هاوڕێ كوڕە تازەكەم پاشەكشە دەكات، ناشڵەژێم و بە دڵنیاییەوە ریزە پرسیاری لێ ناكەم و هەوڵ نادەم بیخەمە قسە.

**پیاوان لە هۆگری ناترسن، پێویستیشیان بە چەند ساڵێك چارەسەریش نییە — تەنیا ئەوەیە لە مەریخەوە هاتوون.**

ئێستا من لە پەیوەندییەكی جواندام. زۆربەی كات رێك بەو شێوەیەیە كە من دەمەوێت و كاتەكانی دیكە گوێ نادەمێ و دڵنیام لەوەی كە دواجار خۆی لە ئەشكەوتەكەی دێتەوە دەرەوە. هەر بۆ سەرسوڕمانی من، خۆی دێتە دەرەوە. من هەمیشە وام هەست كردووە كە پیاوەكانی ناو ژیانی من لەدەستی من رایانكردووە. لە رێگەی تێگەیشتنەوە لە پیاو و لە ئەشكەوتەكانیان، بۆم دەركەوت كە چۆن من ئەوانم لە خۆم دورخستۆتەوە. ئێستا سوپاسگوزارم كە مۆدێلێكی نوێی هۆگریی تەندروستم هەیە، كە لە رێگەی هاوسەنگیكردن لەنێوان كاتی تەنیایی و كاتی پێكەوەییدا بەدەست

دێت، تێکەڵەیەکی جوانی سەربەخۆیی و پشتبەستویی (یەکتر تەواوکردنە).

## ئەگەر چەند لە ئەشکەوتەکەدا بمێننەوە زۆرە؟

(سالی) پێویستی بە ئاماژە هەبو. من دەمپرسی ئایا چەندێك مانەوە لە ئەشکەوتدا بەزۆر دادەنرێت. وردە وردە بۆم دەرکەوت کە هیچ برێکی دیاریکراو نییە. جاری وا هەیە چەند هەفتەیەکەو هەندێ جاری دیکە تەنیا چەند کاتژمێرێکە. ئەوەی لە هەمو شتێك زیاتر تورەی دەکردم ئەوەبو کە نەمدەزانی کەی لە ئەشکەوتەکەی هاتۆتە دەرەوە. نەمدەویست پشت گوێی بخەم و لە دەرەوەی ئەشکەوتەکەیدا بە تەنیا جێی بهێڵم.

ئەوەی لە هەمو شتێك زیاتر تورەی دەکردم ئەوەبو
کە نەمدەزانی کەی لە ئەشکەوتەکەی هاتۆتە دەرەوە.

بیرۆکەکەتم دەربارەی هەبونی ئاماژەی روون بەلاوە جوان بو. ئێستا کە لە ئەشکەوتەکەی دێتە دەرەوە پێم رادەگەیەنێت، خۆیم لێ نزیك دەکاتەوە و سۆزم بۆ دەردەبڕێت. هەروەها دەزانێت کە تا زیاتر لە ئەشکەوتەکەیدا بمێنێتەوە، پێویستم بە رۆمانسیی زیاترە بۆ ئەوەی بتوانم دوبارە بە تەواوی بکرێمەوە لەگەڵیدا. زۆر سەختە بەلامەوە کاتێك لەپڕ پشتگوێم دەخات نەیهێنمە سەر خۆم. فێربونی ئەوەی کە لەوکاتانەدا خۆم بە خۆم بیبەخشم نەك تەنیا ئەو لە هەستکردن بە گوشار رزگار دەکات، بەڵکو یارمەتی منیش دەدات کە کەمتر پێویستم بەوبێت. بە روونی ئەوە دەبینم کە تا زیاتر بتوانم دەستبەرداری ئەو ببم لەکاتی پاشەکشەکردنیدا، ئەو ئاسانتر دەتوانێت بگەڕێتەوە.

## دوبارەکردنەوەی هاوسەرگیرییەکەی دایك و باوکم

(ماری) بۆی دەرکەوت کە رێگەچارەی بۆ دروست بووە: کاتێك هاوسەرگیرییم لەگەڵ (ستیڤن) کرد، نەمدەویست هاوسەرگیرییەکەم وەکو هاوسەرگیرییەکەی دایك و باوکم بێت. بەڵام دوای چەندساڵێکی کەم خۆمم بینییەوە کە هەمان ئەو شتانە دەکەم کە دایکم دەیکردن.

من دڵنیام لەوەی دایکم بۆیە ئەو شتانەی دەکرد چونکە رێگەی دیکەی نەدەزانی.

کاتێـك بـاوکم دەچـووە ئەشـکەوتەکەیەوە دایکـم بۆڵـە بـۆڵی دەکـرد، سـکاڵای دەکـرد، پرسـیاری زۆری لێ دەکـرد، پاشـان رەخنـەی لێ دەگـرت بـەوەی خـۆی بـەدوور دەگرێـت. لۆمـەی دەکـرد لەسـەر نارەحەتییـەکانی و دواجـار خـۆی پاشەکشـەی دەکـردو وازی لـە قسەکردن دەهێنا.

**کاتێک باوکم دەچووە ئەشکەوتەکەیەوە دایکم بۆڵە بۆڵی دەکرد، سکاڵای دەکرد، پرسیاری زۆری لێ دەکرد، پاشان رەخنەی لێ دەگرت بەوەی خۆی بەدوور دەگرێت.**



پـەیمانم بـە خـۆم دا کـە ئێمـە قسـە لەگـەڵ یـەکتردا بکـەین و کێشـەکان چارەسـەر بکەین. بەڵام هێشـتا لـە ئەشـکەوت تێنەگەیشـتبوم. بۆیـە، کاتێـك (سـتیڤن) پاشەکشـەی دەکرد، هەوڵم دەدا بیهێنمە قسە. دواجار خـۆم لـەوەدا بینییـەوە کـە بۆڵـە بـۆڵم دەکـرد، سکاڵام دەکرد و پرسیاری زۆرم لێ دەکرد — رێك وەکو دایکم. وامدەزانی کـە ئـەو هاوکـار نییە و دواجار دەستم دەکرد بە لۆمەکردن. وام هەسـت کـرد شـوم بـە بـاوکم کـردووە و بوم بە دایکم.

کە کتێبی (پیاوان لە مەریخەوە هاتون)م خوێنـدەوە، بـۆم دەرکـەوت کـە ئـەو بـاوکم نـیـیـە، بـەڵام هـەردوکیان یـەك رەچـەڵەکن — هـەردوکیان لـە مەریخـەوە هـاتبون. خوێندنەوەی کتێبی (پیاوان لـە مەریخـەوە هـاتون) بژاردەیـەکی دامـێ. پێشـتر بەراسـتی هیچ رێگەچارەیەکم نەبو، تەنیا ئەو شتانەم دەکرد کە دایکم دەیکردن.

٤

## قسەکردن بە زمانی جیاواز

دوای ئـەوە پیـاوان کتێبەکـەی منیـان خوێنـدەوە و ڤیـدیۆی سیمینارەکانیان بینـی، زۆربەیان لێدوانیان لەسەر (یـەك) مەسـەلە دەدا. بـەلای ئەوانـەوە، بەسودترین زانیـاری ئەوەیە کە چۆن ژنان بە هۆکـاری جیـاواز لەوانـەی پیـاوان پەیوەنـدی دەکـەن. هەنـدێك جار ئەمە لەوەدەچێت کە ئێمە بە زمانی جیاواز قسە بکەین.

ژنان زمان بەکاردەهێنن، هەروەك چۆن پیاوانیش بەکاری دەهێنن، بـۆ ئـەوەی باسـی شتەکان بکەن و کێشەکان چارەسەر بکەن. لەگەڵ ئەوەشدا، هۆکارێکی دیکـەی قسـەکردن بۆ ژنان ئەوەیە کـە وەك ڕێگەیـەك بـەکاری دەهێـنن بـۆ دۆزینـەوەی ئـەوەی دەیانـەوێت بیڵێن؛ هەندێك جار باسی هەستەکانیان دەکەن بۆ ئەوەی شـتەکان چارەسـەربکەن، وەك ڕێگایـەك کـە دواجـار ئاسـودەیان بکـات. کاتـەکانی دیکـە، ژن بـە پێویسـتی دەزانێـت هەسـتەکانی بـاس بکـات و دەریانبڕێـت، تـەنیا وەك ڕێگەیـەك بـۆ نزیکبونـەوە و ئەزمونکردنی هۆگرییەکی زیاتر.

پیـاوان بـە غـەریزە لـەم ڕێگـە جیاوازانـە تێناگـەن، چـونکە پیـاوان بەشـێوەیەکی سەرەکی زمان بۆ ئەوە بەکاردەهێنن کە شتێك بڵێن. پیاوان کـە باسـی کێشـەکان دەکـەن، بەگشتی بـۆ چارەسـەر دەگـەڕێن. لەبەرئـەوە وادەزانێـت کـە ژنـیش باسـی هەسـتەکان و کێشەکان دەکات، لەبەرئـەوە پێیـان وایـە ڕۆڵی پیاوەکە وەك گوێگرێك ئەوەیـە کـە لـە ڕێگەی خستنەڕوی چارەسەرەوە بـە شـێوەیەکی کاریگـەر یارمـەتی ژنەکـە بـدات ئاسـودە ببێـت. پیاوەکـە وەك پیـاوێکی ئاگرکوژێنـەوە لـە ڕوداوێکـی کتـوپڕدا، بـێ سـەبرانە دەیـەوێت بگاتـە ئاگرەکـەو بـە زوتـرین کـات خامۆشـی بکـات. واتـە کـە دەبینێـت و دەبیستێت ژنەکە بێزار دەبێت، پیاوەکە دەیـەوێت لـە ڕێگـەی دەربڕینـی چارەسـەرەوە ئاگری هەستەکانی بکوژێنێتەوە.

**کە دەبینێت و دەبیستێت ژنەکە بێزار دەبێت،**
**پیاوەکە دەیەوێت لە ڕێگەی دەربڕینی چارەسەرەوە**
**ئاگری هەستەکانی بکوژێنێتەوە.**

فێربوونی ئەوەی بە سەبرەوە گوێ بگرێت — نەك تەنیا بە ناکارایی — شارەزایییەکی نوێیە بۆ پیاوان. کەچی پیاوان جار لەدوای جار باس لەوە دەکەن مانەوە بە بێدەنگی و ڕوبەروبونەوەی ئەو ئارەزووەی هەیانە بۆ بڕینی قسە بە ژنەکە و خستنەڕوی چارەسەر بە شێوەیەکی دراماتیکی پەیوەندییەکەیانی گەشەپێداوە. هاوبەشەکانیان زۆر دڵخۆشتر و سوپاسگوزارترن. خۆشبەخت ئەو پیاوەیە کە بۆی دەرکەوتووە تێرکردنی پێویستی ژن بە پەیوەندیکرن و گوێ لێ گیران داخوازییەکی هەرە گرنگی پەیوەندییە پڕ لە خۆشەویستی و هاوئاهەنگەکانە. ئەگەر پیاو گوێگرێکی باش بێت، ژن دەتوانێت جار لەدوای جار جێگە لە دڵی خۆیدا بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی بتوانێت ئەو پیاوەی خۆش بوێت و وەك خۆی قبوڵی بکات.

## ئاسانکردنی پەیوەندیکردن

(ئارت) وتی: هەرگیز نەمدەتوانی لەوە تێبگەم بۆچی (لیندسەی) هێندە باسی کێشەکەی دوبارە دەکاتەوە، بە تایبەتی ئەو کاتانەی من نەمدەتوانی هیچ شتێك لەبارەیەوە بکەم. بەڵام کە زانیم چاوەڕوانی ئەوەم لێ نەکراوە کێشەکانی بۆ چارەسەر بکەم زۆر دڵم خۆش بو. ئەمە مەسەلەی پەیوەندیکردنی زۆر ئاسان کردوە. ئەگەر بتوانم تەنیا گوێ بگرم و پێویست نەکات کێشەکانی بۆ چارەسەر بکەم بۆ ئەوەی ئاسودە ببێت — ئێ کەواتە ئاسانە. دەتوانم گوێ بگرم.

**بە درێژایی ڕۆژ من لەسەر کارم و خەریکی چارەسەرکردنی کێشە و گیروگرفتی جۆراوجۆر دەبم، لەبەرئەوە دواشت کە دەمەوێت ئەنجامی بدەم کاتێ دەگەڕێمەوە ماڵەوە ئەوەیە ڕیزێک کێشەی دیکە چارەسەر بکەم.**

بە درێژایی رۆژ مـن لەسـەر كـارم و خـەریكی چارەسـەركردنی كێشـە و گیروگرفتـی جۆراوجـۆر دەبم، لەبەرئـەوە دواشـت كـە دەمـەوێت ئـەنجامی بـدەم كاتـێ دەگەڕێمـەوەماڵەوە ئەوەیە ریزێك كێشەی دیكە چارەسەر بكەم. كاتێك ئەو باسی كێشـەكانی دەكـرد، من هەمیشە وام دەزانی لەبری ئەوەی پشوو بدەم دەبێت كاری زیاتر بكەم. ئێستا تـەنیا گوێ دەگرم و پشو دەدەم، دەزانم كە بۆ ئەوەی ئاسودە بێت ئەو تـەنیا پێویسـتی بەوەیـە هەست بكات گوێی لێ دەگیرێت.

## دەربڕینی شتە هەڵەكە

(لـێس) فێـری ئـەوەبو كـۆنترۆڵی ئـارەزوی وەڵامدانـەوە بكـات. كاتـێ (گلۆریـا) باسـی رۆژەكـەی خـۆی دەكـرد لەگـەڵ منداڵەكانـدا، هەرچـییـەكـم دەگـوت بـە هەڵـەی دەزانـی. هەسـتی بـەوە دەكـرد بـە هەڵـە لێی تێدەگـەم، قـەدری نـازانم هێرشـی دەكەمەسـەر. نەمدەزانی بۆ. ئەو بو دەیویست زیاتر قسەبكەین، بەڵام هەر كاتێك قسـەمان دەكـرد بـە تورەبون كۆتایی دەهات. گلەیی ئەوەی هەبو كە من گـوێی لێ نـاگرم، بـەڵام هـەر شـتێكم بگوتایە بارودۆخەكە خراپتر دەبو.

فێربوم هیچ شتێك نەڵێم. پاش ماوەیەك، وای لێ هات كـە ئـەو قسـەی دەكـرد، تـەنیا خەیاڵ دەیبردمەوە. ئیتر بەراستی بێزار و ماندو دەبـوم. هـەمو قسـەكانی لەیـەك دەچـو منـیش بـە كورتییەكـەی حـەزم لێ نـەبو. كاتێـك كتێبـی (مـەریخ و ڤینۆسـی پێكـەوە تاسەر)ی خوێندەوە هەمو شتێك بەرەو گۆڕانكاری چو.

**پێی گوتم كە بەراستی سوپاسگوزارە كە دەتوانێت**
**هەستەكانی خۆیم بۆ باس بكات و پێویست ناكات من هیچ شتێك بڵێم.**

پێی گوتم كە بەراستی سوپاسـگوزارە كـە دەتوانێـت هەستەكانیم بـۆ بـاس بكـات و تێگەیشـت لـەوەی كـە بـۆ مـن سـەختە تـەنیا گوێ بگـرم، بەتایبـەتی لەبەرئـەوەی كـە ئـەو نایـەوێت مـن چارەسـەری بـۆ بخەمـە ڕو. بـەردەوام بـو هەتا پێی گوتم تەنیا ئەگەر گوێی لێ بگرم و هیچیش نەڵێم هەر سودی لێ دەبینێت.

ئێستا هیچ ناڵێم و دەشزانم بەم کارە یارمەتی دەدەم و ئەمەش گۆڕانێکی گەورەیە. پێم خۆشە کاتێك دەڵێت (سوپاس بۆ گوێگرتنت — بەراستی یارمەتیدەرە.) ئێستا جیاوازە چونکە دەزانم کە تەنیا بە گوێگرتن ئەو شتەی دەدەمێ کە پێویستی پێیەتی. وردە وردە دەستم بەوە کردووە زیاتر پەیوەندی لەگەڵ بکەم و زیاتر بەئاگابم لە ژیانی و بایەخی پێبدەم. فێربوم کە پێویست ناکات من کێشەکانی بۆ چارەسەر بکەم ئەویش بەمە ئاسودە دەبێت. ئێستا هەردوکمان هیوامان بە پێکەوەبونمان هەیە. ئەو هەست دەکات کە من خۆشم دەوێت و منیش دەمەوێت یارمەتیدەر بم.

## نەخشەیەکی بنەڕەتی بۆ پەیوەندییەکان

(دانی) تێگەیشت بۆچی خۆی و هاوسەرەکەی زوو زوو مشتومڕیان دەبو. ئێمە چواردە ساڵ بو هاوسەرگیرییمان کردبو. یەکترییمان خۆش دەویست بەڵام بەردەوام مشتومڕمان بو. من وامدەزانی (مارشا) زۆر نەرێنییە. دوای چەند ساڵێك راوێژ وەرگرتن، کۆڵمان داو لە یەکتر جیابوینەوە. دواتر من کتێبی (پیاوان لە مەریخەوە هاتون)م خوێندەوە. بەلای منەوە تەواو چاوەڕواننەکراو بو کە زانیم ژنان پێویستیان بەوەیە باسی هەست و کێشەکانیان بکەن ئینجا دەتوانن بگەنە ئەوەی دڵخۆشتر و خۆشەویستتر ببن.

**بەلای منەوە تەواو چاوەڕواننەکراو بو کە زانیم ژنان پێویستیان بەوەیە باسی هەست و کێشەکانیان بکەن ئینجا دەتوانن بگەنە ئەوەی دڵخۆشتر و خۆشەویستتر ببن.**

من هەمیشە وام لێك دەدایەوە ئەو بە هەست و لێکدانەوەکانی دەیەوێت تەنیا وام لێ بکات هەست بکەم هەرچییەکی بۆ بکەم بایەخی نازانێت. فێربون لەبارەی ڤینۆسییەکانەوە و پێویستییە رەواکەیان بۆ قسەکردن رزگاری کردم لەوەی شتەکە بهێنمە سەرخۆم. بۆم دەرکەوت کەسە نەرێنییەکە من بوم. ئەو تەنیا هەستەکانی باس دەکردو منیش کاردانەوەی نەرێنیم دەنواند. پاشان ئەمە بەرەو گێژاوەکەی بردین و

گەیشتینە قۆناغی ئەوەی ئیتر قسە بە یەکتری بڵێین.

پەیوەندییم پێوە کردو باسی ئەو شتەم بۆ کرد کە فێری بوبوم. شتەکەی بەهەند وەرگرت و پێکەوە چوینە دەرەوە بۆ نانخواردن. زۆر خۆش بو، لەپڕ هەردوکمان رێك کەوتین. وشەمان هەبو کە هەستەکانمانی پێ دەربڕین و رێگەی ئەرێنیشمان هەبو کە پشتگیری یەکتری پێبکەین. جاران، مەسەلەکە ئەوەنەبو کە یەکترمان خۆش نەوێت، بەڵکو ئەوەبو کە نەماندەتوانی بە شێوازێکی ئەرێنی پەیوەندی بکەین. من بەراستی گوێم نەدەگرت.

ئێستا من کتێبی (پیاوان لە مەریخەوە هاتون) وەك نەخشەرێگایەکی سەرەکی بەکاردەهێنم بۆ پەیوەندییەکەمان. مرۆڤ ناتوانێت بەبێ نەخشە خانو دروست بکات. وابزانم لەرابردودا بۆیە وازم هێنا چونکە نەمدەزانی چی بکەم. بەڵام ئێستا ئەو نەخشەیەم هەیە بۆ دروستکردنی پەیوەندییەکەمان. دەمەوێت زۆر سوپاست بکەم. تۆ بەنرخترین شتی ژیانت بۆ گەڕاندمەوە.

## فێربونی نەریتەکانی ڤینۆس

(مارسا) لێدوانێکی دابو لەسەر گوێگرتن. تێگەیشتن لەوەی کە بەلای پیاوەوە سەختە ببێتە گوێگرێکی باش. یارمەتی دام هەوڵەکانی (رۆجەر) بنرخێنم کە بۆ گوێگرتن لە من دەیدات. لەبری ئەوەی هەست بکەم کە گوێگرتنی بەلاوە گرنگ نییە، ئێستا دەزانم کاتێك کە چارەسەر دەخاتە رو، مانای ئەوەنییە کە بایەخ نادات، بەڵکو لەبەرئەوەیە کە بیری چۆتەوە من پێویستم بەچییە.

**کاتێک کە چارەسەر دەخاتە رو، مانای ئەوەنییە کە بایەخ نادات، بەڵکو لەبەرئەوەیە کە بیری چۆتەوە من پێویستم بەچییە.**

ئەو لە مەریخەوە هاتووەو هێشتا لە قۆناغی فێربونی نەریتەکانی سەر هەسارەی ڤینۆسدایە. گۆڕینی خووە کۆنەکان کاتی دەوێت. لەبری ئەوەی ئازاری بدەم، تەنیا زەردەخەنەیەك دەکەم و دەڵێم ئێستا تەنیا دەمەوێت

ببمە ڤینۆسی‌یەکی راستەقینە پێویست ناکات تۆ هیچ بڵێیت؛ بەرگری لەخۆی ناکات بەڵکو لەبری ئەوە پێدەکەنێت و دەڵێت ئۆف و تەواو. من بەردەوام دەبم و ئەو گوێ دەگرێت.

## داوای لێبوردنی کرد کە ئەوەندە بێهەست بووە

(مارگرێت) گوتی: ئەگەر بمەوێت باسی ئەو شتانە دەکەم کە ئازارم دەدەن، (تۆم) یان دەڵێت ئینجا چی‌یە؟ یاخود دەڵێت دەست پێمەکەرەوە! بەمەش بێدەنگم دەکات. پاش ماوەیەك ئیتر وازم لەوە هێنا هەوڵ بدەم بچێتە دڵمەوە. دوای خوێندنەوەی کتێبەکەی تۆ، داوای لێبوردنی لێ کردم کە ئەوەندە بێ هەست بووە بەرامبەرم. پێی گوتم کە دەیەوێت ئیتر گوێم لێ بگرێت و قسەکانم پێنەبرێت. واو! هەمو شتێك گۆڕاوە. ئێستا بەڕاستی پێم خۆشە کاتی لەگەڵدا ببەمەسەر. نەك تەنیا خۆشم دەوێت، بەڵکو چوٚتە دڵمەوە.



## تەنیا خزمەتگوزاری ( لێو )م نەدەویست

(جێسیکا) ئەم چیرۆکەی هەبو: یەکەمجار کە لە (جۆن گرەی) باسی ئەم بابەتەم گوێ لێبو، هیچ حەزم لێ نەکرد. دوایین مەسەلە کە پێویستم بو ئەوەبو پیاوێك بە پێچەوانەی حەزی خۆی دابنیشێت گوێم لێ بگرێت. تەنیا خزمەتگوزاریی (لێو)م نەدەویست. پیاوێکم دەویست کە بایەخم پێبدات و بەراستی حەز بکات قسەکانم ببیستێت. هەستم بە سوکایەتی و بێ نرخی دەکرد داوا لە پیاوێك بکەم گوێم لێ بگرێت و کە خۆی نایەوێت گوێ بگرێت. بیرکردنەوە لە پیاوێك کە جارجار سەری رابوەشێنێت و وەکو ئامێرێك بڵێت (ئم .. ئهم .. ئهم .. بەراست)، بەلامەوە هیچ هۆگری و خۆشەویستییەکی تێدا نەبو، بەڵام کاتێك کە ئەمەم تاقی کردەوە و سەرم سوڕما - ئەمە منی ئاسودە کرد.

**پیاوێکم نەدەویست کە ئەگەر خۆی بەراستی نەیەوێت، گوێم لێ بگرێت.**

حەزم لەوەبو بتوانم قسە بکەم بەبێ ئەوەی قسەکەم پێ ببڕدرێت. لەوەوپێش هەرگیز شتی وا روی نەدابو. نە رستەکانی بۆ تەواودەکردم، نە چارەسەری دەخستەرو،

نە لێدوانی بەرگریکارانەی دەبڕی. ئەمەی ئێستا شتێکی نایابە. ئێستا لەبری ئەوەی هەست بکەم کە نایەوێت گوێ بگرێت، دەبینم ئامادەیە گوێ بگرێت چونکە دەیەوێت یارمەتیدەر بێت. ڕەنگە بەراستی نەیەوێت گوێ بگرێت، بەڵام دەیەوێت یارمەتیم بدات و لەبەرئەوە من بەراستی هەست دەکەم خۆشی دەوێم!

## ئەو کێشەی هەبو نەك من

(ستیف) باسی پرۆسەی فێربونەکەی خۆی کرد. هەرکاتێك لەگەڵ هاوسەری پێشوم دادەنیشتم، کاتێکی زۆر ناخۆش بو. دەیگوت ناتوانێت قسەم لەگەڵدا بکات. ئەوە بەلای منەوە ئاسایی بو، بەڵام دوو منالی سەرنجراکێشمان هەبو. ئەوە ئازاری دەدان کە ببینن دایك و باوکیان یەکتری ڕەت دەکەنەوە و یەکتر پەست دەکەن.

من هیچ کێشەیەکم نەبو لە پەیوەندیکردندا بەڵام ئەو هەیبو. هەرچۆنێك بێت ئەو بو کە بە منی گوت حەزناکات قسەم لەگەڵدا بکات، منیش پارێزەر بوم، ڕاوێژکارێکی پیشەیی بوم. ئاشکرابو کە دەتوانم هەستەکانم بخەمە لاوەو بە شێوەیەکی ئەقڵانی قسە بکەم. ئەو کێشەی هەبو نەك من.

دواجار بۆم دەرکەوت ئەگەر ئەو نەیەوێت قسەم لەگەڵدا بکات، مانای وایە من بەشێکم لە کێشەکە. بە بەکارهێنانی شارەزایی لێکۆڵینەوە یاساییەکانم. هەر کاتێك قسەمان دەکرد دادگاییم دەکرد. هەر کاتێك دەیویست هەستەکانی دەربڕێت من بەردەوام قسەکەم پێ دەبڕی و ڕاستم دەکردەوە. من ڕونم دەکردەوە بۆچی ئەو نابێت هەست بە بێزاری بکات. من بە بەردەوامی گشتاندنەکانی ئەوم بە نمونەی دژ پوچەڵ دەکردەوە، بەبێ ئەوەی هیچ گوێ بدەم بە هەستەکانی ئەو.

**هەر کاتێك قسەمان دەکرد دادگاییم دەکرد.**

دوای خوێندنەوەی کتێبەکەی تۆ، نامەیەکم بۆ نوسی و داوای لێبوردنم لێ کرد بەرامبەر بەوەی گوێم پێ نەداوەو پێم گوت لە داهاتودا بە جدی هەوڵ دەدەم بە

ڕێـزەوە گـوێ بگـرم بـەبێ ئـەوەی لێـدوانی ئازاردەرانـە بـدەم. ئـەم تاکـە لێـدوان و تێگەیشتنە هەمو پەیوەندییەکەمانی گۆڕی. فێـری ئـەوەبوم شـارەزاییە یاسـاییەکانم لـە شـوێنی کارەکـەم بـەجێ بهـێڵم و لەگـەڵ ئـەودا تـەنیا گـوێ بگـرم و هـەوڵ بـدەم لـە ڕەوابوونی گۆشەنیگاکانی تێبگەم — ئەگەرچی ناکۆکیش بم لەگەڵیاندا. ئێستا نەك هـەر قسـە دەکـەین، بـەڵکو هـاوڕێی یەکتریشـین. منداڵـەکانمان دایـك و باوکیـان دەبیـنن کـە یەکتریان خۆش دەوێت و ڕێز لەیەکتر دەگرن. ئای ئەم پەیامە چ دیارییەکی تایبەتە؟؟

## پێویستم بەوە نییە چاك بکرێمەوە

(ئێریکـا) گـوتی: هـەر کاتێـك لەسـەر شـتێك گفتوگۆمـان بکردایـە، پـاش ماوەیـەك مەسەلەکە بە مشتومڕ کۆتایی دەهات. ئەو دەیگوت خەتای منـە کـە ئەوەنـدە ناڕەحـەتم و تەنیا ئەگەر لەوساتەدا بـژیم و شـتە باشـەکانی ژیـانم بنـرخێنم دیـارە هەسـتێکی زۆر باشترم دەبێت. ئیتر ئەو شتانەم لێ نابێتە کێشەی ئاڵۆز و گەورە.

من دەمگوت ئەو تێناگات، بایەخ نادات، هەمو کێشەکان کێشـەی مـن نـین. پـێم وت کـە ئەگەر ئەوەندە هەوڵ بدات چاکم بکاتـەوە ئـیتر نـاتوانم قسـەی لەگەڵدا بکـەم. دەمویسـت ئەو بەرپرسیارێتی کێشەکانمانم لەگەڵدا لەئەستۆ بگرێت و مافیش بدات بە من.

---

"ئاساییە کە لەگەڵم کۆك نەبێت. تەنیا دەمەوێت

گوێ لە بۆچوونەکەم بگرێت و لێی تێبگەیت."

---

کـە تێگەیشـتم پیـاوان بـە شـێوەیەکی ئۆتۆمـاتیکی دەیانـەوێت کێشـەکان چارەسـەر بکەن، توانیم ڕێگەکەم بگۆڕم. ئێستا کاتێـك دەسـت بـە مشـتومڕ دەکـەین، بارگرژییەکە بەوە پوچەڵ دەکەمەوە کە یەکـەمجار دەوەسـتم و پاشـان ئـەو ئامـادە دەکـەم بـۆ ئـەوەی گوێ لە قسەکانی من بگرێت.

من دەڵێم: پێویست ناکات تۆ هاوڕا بیت لەگەڵمدا. ئاسایـیـە. دەمـەوێت تـەنیا گـوێ لـە گۆشـەنیگاکەم بگریـت و لێی تێبگـەیت. پێویسـت ناکـات دەسـتبەجێ ئـەم کێشـەیە

چارەسەر بکەین. ئەگەر تەنیا گوێم لێ بگریت، ئینجا منیش دەتوانم گوێ لەو قسانە بگرم کە تۆ دەیانکەیت. ئەمە وام لێ دەکات زۆر ئاسودەتر ببم.

ئەم کارەی من وا دەکات ئەو کتوپڕ دابمرکێتەوە و گوێ بگرێت. پێویست ناکات شەڕ بکەین. ئەو بە خاوەن هەق خۆی دەبینێتەوەو منیش مافی ئەوە بەدەست دەهێنم کە باس لە هەستەکانم بکەم و دەریانبڕم — بەبێ ئەوەی قسەکەم پێ ببڕێت، یاخود چاك بکرێتەوە.

## تۆ تێ ناگەیت

(پاوڵ) وتی؛ هاوسەرەکەم بەردەوام سکاڵای دەکرد دەیگوت (تۆ تێناگەیت!) ئێستاش هەندێك جار وا دەڵێت، بەڵام ئێستا ئەم گلەیی و سکاڵایە نابن بە مشتومڕ. پێش ئەوەی بەشداری وۆرکشۆپەکەی بکەین، هەمو جارێك کە دەیگوت تۆ تێناگەیت، من مشتومڕم دەکرد و روونم دەکردەوە کە تێدەگەم. هەندێك جار تەنانەت دەمگوت کە لە خۆی زیاتر تێدەگەم کە چ شتێك ئازاری دەدات. ئەمە بەڕاستی ڕێگەیەکی شکستخواردو بو.

یەك گۆڕانی سادە دنیایەك جیاوازی دروست کرد. ئێستا کە پێم دەڵێت تێناگەیت، بۆم دەردەکەوێت مەبەستی ئەوەیە بڵێت پێویستی بەوەیە زیاترم بۆ باس بکات بۆ ئەوەی بە تەواوی تێبگەم. فێربوم لە وەڵامدا بڵێم "باشە، تۆ راست دەکەیت. من تێناگەم، زیاترم بۆ باس بکە." ئەم تاکە گۆڕانکارییە کۆتایی هێناوە، بە هەمو مشتومڕەکانمان.

**"باشە، تۆ راست دەکەیت. من تێناگەم، زیاترم بۆ باس بکە."**
**ئەم تاکە گۆڕانکارییە کۆتایی هێناوە، بە هەمو مشتومڕەکانمان.**

فێری ئەوەبوم کاتێك هەلی ئەوەی دەبێت قسە بکات بەبێ ئەوەی من قسەکەی پێ ببڕم، ناچار بەسۆزتر دەبێت بەرامبەرم. هەرچەندە ئەم کارە لەوە زیاتر دەخایەنێت کە من حەزدەکەم، بەڵام دواجار هەست دەکات زیاتر لێی تێدەگەم.

بەلامەوە سەخت بو دان بەوەدا بنێم کە پێشتر لێی تێنەگەیشتبوم، بە تایبەتی ئەوکاتەی کە هەستم دەکرد تێگەیشتوم. بەڵام دواجار فێری ئەوەبوم کاتێك ئەو

هەست بکات لێی تێ ناگەم، مانای وایە ئەو راست دەکات و بە دڵنیاییەوە من لێی تێنەگەیشتوم بەو شێوەیەی کە ئەو پێویستی پێیە. ددانان بەوەدا کە ئەو لەسەر هەقەو من لێی تێنەگەیشتوم لەراستیدا مانای ئەوەیە من تێدەگەم لەوەی کە ئەو هەست دەکات تێنەگەیشتوم. بەم پشتگیرییەوە دەتوانێت بەردەوام بێت لەسەر باسکردن و گەڕان بەناو هەستەکانیدا. داننانم بەوەی تێی نەگەیشتبوم بەراستی یارمەتیدا هەست بکات کە لێی تێدەگەم.

## وازهێنان لە تورەیی و بەدەستهێنانی ئەو شتانەی پێویستم بون

(جیری) چیرۆکەکەی خۆی گێڕایەوە. ئەو رۆژەیان هاوسەرەکەم زۆر هاوسۆزیی نیشاندا بەرامبەر بەو کێشانەی لە شوێنی کارەکەم توشم بوبون. من بەشێوەیەکی گشتی زۆرم پێناخۆشە ئامۆژگارییم بکات، یاخود گومانی لێم هەبێت و بەراستی پێبخاتە ناوچەی منەوە (خۆی لە کاروبارەکانم هەڵبقورتێنێت). ئەمجارەیان لەبری ئەوەی تورە ببم، خۆ لادانم تاقی کردەوە و هەوڵم دا لێدوانەکان و ترسەکانی ئەو نەهێنمە سەرخۆم.

**لەبری ئەوەی تورە ببم، خۆ لادانم تاقی کردەوە و**
**هەوڵم دا لێدوانەکان و ترسەکانی ئەو نەهێنمە سەرخۆم.**

تەنیا رێگەم دا قسە بکات و تورە نەبوم. بۆم دەرکەوت کە ئەو لە ڤینۆسەوە هاتووە و شێوازی ئەو بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ترسدا ئەوەیە باسیان لێوە بکات. دوای ئەوەی ئەو شتەم پێ بەخشی کە پێویستی پێ بو، داوای ئەو شتەم لێ کرد کە من پێویستم پێ بو: کە قسەکانی تەواوکرد، پێم گوت دەزانم تۆ دەترسیت و بەلاتەوە گرنگە قسەی لەبارەوە بکەیت. ئەوەی دەمەوێت لە تۆی ببیستم ئەوەیە تۆ متمانەم پێ بکەیت کە دەتوانم خۆم روبەروی شتەکان ببمەوەو تۆش شادمانیت بەوەی کە من لێرەم شتەکان بگرمە دەست.

ئەو کە هەستی دەکرد گوێی لێ گیراوە، توانی ئەو پشتگیرییەم بۆ دەرببڕێت کە پێویستم پێبو. زۆر بە ئامادەییەوە گوتی کە متمانەم پێ دەکات و زۆر سوپاسگوزارە

کە پێکەوەین. ئیتر لەبری ئەوەی هەست بە ئازار بکەم بەهۆی ترس و هەستەکانی ئەوەوە بە زەردەخەنەیەك و بە هەستێکی خۆشەوە باوەشم پیاکرد.

## هێماکانی ئاگادارکردنەوە

(سام) بیروبۆچونی خۆی باس کرد: بۆم دەرکەوت هەر کاتێك (تیا) بە گەرمی هەڵسوکەوت دەکات بەڵام زۆر قسە نەکات، ئەوە هێمایەکی ئاگادارکردنەوەیە. مانای وایە شتێك لە ناخیدا ئازاری دەدات و ئەگەر بە زویی نەیهێنمە قسە، خراپتر دەبێت. کاتێکیش دورەپەرێزە، پێویستە بایەخی پێبدەم نەك پشتگوێی بخەم. مانای وایە من کارێکم کردووە یاخود کەمتەرخەم بوم لە ئەنجامدانی کارێکدا و ئەمەش لە ناخی ئەودا کەڵەکە دەبێت و رێگری لێ دەکات بە خۆشەویستانە مامەڵە بکات.

**کاتێکیش دورەپەرێزە، پێویستە بایەخی پێبدەم نەك پشتگوێی بخەم.**

ئەگەر تێبینی ئەوە نەکەم کە ناڕەحەتە، وا هەست دەکات کە بایەخی پێ نادەم. خۆ ئەگەر ئەو ناچاربێت دەستپێشخەری بکات لە قسەکردن بۆ دەربڕینی هەستەکانی، ئەوا زیاتر ناڕەحەت دەبێت و کاتێکی زیاتری پێدەچێت تا شتەکان چارەسەر دەبن. ئامادەییەکەم بۆ تێبینی کردنی ئەم بابەتەو پرسیارکردن لەبارەی هۆکارەکەوە یارمەتیدەرێکی گەورەیە بۆ چارەسەرکردنی ئەو هەستانەی کە لە ناخیدا کەڵەکە دەبن.

## راوەماسی

(هارڤی) لە پێویستییەکانی هاوسەرەکەی تێگەیشتووە. هەرکاتێك (ریبیکا) زۆر حەزی لە قسەکردنبێت وا خۆی دەردەخات کە بە هیچ جۆرێك حەزی لە قسەکردن نییە. پاشان کاتێك من ئاخاوتنەکە دەست پێدەکەم، ئەو یەکسەر دەڵێت هیچ مەسەلەیەکی وای نییە باسی بکات.

دەپرسم (ئایا شتێك هەیە؟) ئەویش دەڵێت نەخێر هیچ نییە. جاران دوای ئەم وەڵامە دەڕۆیشتم و وامدەزانی ئەرکی خۆمم بەجێهێناوەو ئیتر دەتوانم کەمێك

تەماشای تەلەفزیۆن بکەم. بەڵام ئەوە هەڵەیەکی گەورە بو.

ئێستا فێربوم لە قسەکانی تێبگەم. کە دەڵێت شتێکی وا نییە باسی لێوە بکات، دەزانم دەیەوێت قسە بکات بەڵام پێویستی بەوەیە من پرسیاری لێ بکەم تاکو وردە وردە ئازادی بکەم. لەبری ئەوەی دوربکەومەوە، شتێك دەکەم وەك ماسیگرتن وایە. بەردەوام دەبم لەپرسیارکردن هەتا ماسییەکە دەگرم.

---

**لەبری ئەوەی دوربکەومەوە، شتێک دەکەم وەک ماسیگرتن وایە.**

**بەردەوام دەبم لەپرسیارکردن هەتا ماسییەکە دەگرم.**

---

ئەو نایەوێت من تەنیا هەر گوێی لێ بگرم، بەڵکو دەیەوێت تێبینی ئەوەش بکەم کە رەنگە ئەو پێویستی بە قسەکردن بێت. دەیەوێت تێبگەم لەو شتانەی لە ژیانی ئەودا رودەدەن، بۆ ئەوەی بزانم لەبەرچی نارەحەتە. دەیەوێت پرسیاری ئەوتۆی لێ بکەم دەریبخات کە دەزانم چی لە ژیانیدا دەگوزەرێت. رێك وەك ماسیگرتن، ئەمە سەبری دەوێت، بەڵام دواجار پرسیارە راستەکە دەکەم و ئەویش وردە وردە دەکرێتەوە.

پێشتر وام بیردەکردەوە ئەگەر ئەو بیەوێت باسی شتێك بکات پێویستە خۆی بێت و باسی بکات. من بەو جۆرە بوم. بەڵام ئێستا لەوە تێدەگەم کە بەلای ڤینۆسییەکانەوە چاکتر وایە کەسێك بایەخت پێبدات و چاودێریت بکات. من پێم خۆشە ئەو کەسە من بم.

## من گوێ دەگرم چونکە خۆشم دەوێیت

(وێندی) گوتی: خۆشەویستترین شتی (جێراڵد) بەلای منەوە ئەوەیە کە هەمیشە ئامادەی گوێگرتنە. ئەگەر کێشەیەك هەبێت باسی لێوە دەکەین. هەرچەندە رەنگە ئاسانتر ئەوەبێت کە نادیدەی بگرین و تەماشای تەلەفزیۆن بکەین، بەڵام ئەو ئامادەیە دابنیشێت و گوێ بگرێت. ئەوەی من دەیڵێم هەندێك جار بە دڵنیاییەوە قسەیەکی جوان نییە و پەیوەندی بە بابەتەکەشەوە نییە. دیارە ئەویش هەمو جارێك قبوڵی نییە، و لە گوێگرتنەکەش زۆر ئاسودە نییە، بەڵام هەرچۆنێك بێت دەیکات.

(جێراڵد) گوتی: بە دڵنیاییەوە راست دەکات. کارێکی سەختە گوێ لە هەستەکانی

بگریت؛ بەشێکی من دەیەوێت رابکات، بەڵام من دەمێنمەوە چونکە تێگەیشتوم کە ئەمە چەند گرنگە بۆ ئەو. هەرچەندە مەرج نییە من ئەو شتانەم بەدڵ بێت کە دەیانڵێت، بەڵام گوێی لێ دەگرم چونکە خۆشم دەوێت و دەزانم پێویستی بەم پشتگیرییەی من هەیە.

**کارێکی سەختە گوێ لە هەستەکانی بگریت؛ بەشێکی من دەیەوێت رابکات، بەڵام من دەمێنمەوە چونکە تێگەیشتوم کە ئەمە چەند گرنگە بۆ ئەو.**

تەنانەت پێشی دەڵێم، ئەمە زۆر سەختە بۆ من بەڵام من ئامادەم گوێ لە هەستەکانت بگرم و لەبەرچاویان بگرم چونکە خۆشم دەوێیت؛ گوتنی ئەم رستەیە بە دەنگی بەرز نەك تەنیا یارمەتی ئەو دەدات هەست بە ئامادەیی من بکات بۆ گوێگرتن، بەڵکو بۆ خۆیشم ئاسانتر دەبێت گوێی لێ بگرم. وا دەزانم یارمەتییەکە بۆ من ئەوەیە کە بیرم دەخاتەوە چارەسەرەکە خۆشەویستییە و بە گوێگرتن لێی ئەو خۆشەویستییەی پێدەبەخشم کە پێویستی پێیەتی. کەواتە من ئەو شتە بە باشترین رێگە ئەنجام دەدەم کە زۆرترین پێویستی پێیە لە مندا.

## کە دەمانەوێت قسەبکەین، دەبێتە فەرتەنە

(بروس) چیرۆکەکەی خۆی گێڕایەوە. ئێمە بیست ساڵە هاوسەرگیریمان کردووە. ئەمە دووەم هاوسەرگیری هەردوکمانە. ئێمە دو خێزانمان پێکەوە بەستۆتەوە — من سێ منداڵم هێناوەو ئەویش منداڵێك. هەرچوار منداڵەکانمان گەورە کردون. لەسەرەتای هاوسەرگیرییەکەمانەوە لە پەیوەندیکردندا توشی کێشە بوینەتەوە. بڕێکی زۆر بێ متمانەیی و بەرگریکردن لەخۆماندا هەبووە. دوای ئەوەی منداڵەکان بەجێیان هێشتین، هاوسەرگیرییەکەمان خراپتر بو تەنانەت بۆ ماوەیەکیش نیمچە جیابونەوەیەك جیابوینەوە. چەندین ساڵە ژوری نوستنەکەمان جیایە. هەر کاتێك هەوڵ بدەین لەبارەی شتە بچوکەکانەوە قسە بکەین، بەسەر یەکتریدا دەتەقینەوە.

کاتێك کتێبەکەی تۆم خوێندەوە، شتی وام تیابەدی کرد کە (گرێچین) چەندین ساڵە پێمی دەڵێت. لەوەو پێش هەرگیز بە تەواوی تێنەگەیشتبوم کە باسی چی دەکات،

یاخود بۆچی ئەوەندە گرنگە بەلایەوە. شتی واشم بینی کە چەندین ساڵە هەوڵ دەدەم بەوی بڵێم، بەڵام سودی نەبووە. روونکردنەوەی ئەو شتانەم بینی کە ئەزمونم دەکردن بەڵام نەمتوانیبو لە گۆشەنیگایەکی ئەرێنییەوە وێنایان بکەم. ئەو هیوایە دروستبو کە دواجار دەتوانم پەیوەندی بکەم. ئەمەش شادمانی کردم.

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا (گرێچین) زۆر گەرموگوڕ نەبو. وەڵامەکەی بۆ من ئەمە بو: "هەتا گۆڕانەکە بە چاوی خۆم نەبینم بڕوات پێناکەم. ئەگەر بگۆڕێیت دەڵێم راست دەکەیت". من لەبری ئەوەی لە وەڵامی ئەم بێ متمانەییەیدا بکەومە بەرگریکردن یەکسەر رەوابوونی هەستەکانیم بۆ دەرکەوت. پاش چەندین ساڵ لە هەستکردن بە پشتگوێکەوتن، بۆم دەرکەوت کە چاککردنی متمانەکە کاتی دەوێت و پێویستە سەرلەنوێ دروستی بکەمەوە. ئەوەشم بۆ دەرکەوت کە پێداگرییە نەرمەکەم بۆ بایەخدان بە ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکارییانە و فێربونی چۆنێتی گوێگرتن یارمەتی ئەو دەدەن بەرهەڵستییەکەی بەرەڵلا بکات و هەروەها یارمەتی منیش دەدەن. ئاسان نییە لەسەرەتاوە دەست پێبکەیتەوەو هەمو هەنگاوێکت بەبێ متمانەییەوە تەماشا بکرێت و بەرهەڵستی بکرێت. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، من هەست بە بەهێزی خۆم دەکەم لەم پرۆسەیەدا و حەزم لەم هەستکردنەیە.

**ئەو تەنیا پێویستیی بە پێداگرییە نەرمەکەم بو**
**کە یارمەتی بدەم بەرهەڵستییەکەی بەرەڵا بکات.**

کە لە هەوڵەکانیشدا شکست دەهێنم، لەبری ئەوەی توڕەیییەکانم بەسەر (گرێچین)دا بڕێژم، بە تەنیا دەست دەکەم بە نوسین و دەربڕینی هەستەکانم لە (نامەیەکی خۆشەویستی)دا وەك لە کتێبەکەتدا پێشنیارت کردووە. سەرەتا بە توڕەیی و ناڕەحەتییەکی زۆرەوە دەست پێدەکەم و دواجار بەوە تەواو دەبم کە ئازادیم بەدەست هێناوەو دووبارە هەست بە خۆشەویستی دەکەم. ئەم هەستە پڕسۆزانە یارمەتیم دەدەن لە گۆشەنیگای ئەو تێبگەم و جارێکی دیکە هەوڵ دەدەم ببمە گوێگرێکی باشتر.

من و هاوسەرەکەم چرکەساتی ناسك و ماوەی کورتی پەیوەندیکردنی پڕماناشمان هەبووە. لەگەڵ ئەمەشدا، هێشتا هەندێك جار خۆمان دورەپەرێز رادەگرین و چاودێری

دەکەین. هەرچەندە مێژویەکی درێژی نەرێنیمان هەیە، بەڵام هیوایەکیش هەیە. من ئێستا زۆر شادمانم بەرامبەر ژیان و بەرامبەر بە ئەگەرەکانی ناو ژیانم.

ئێستا دەتوانم زۆر روونتر کێشەکانی ناو پەیوەندییەکەمان ببینم و دەزانم دەبێت چی بکەم. دەتوانم گۆڕانکارییەکانی ناو خۆم ببینم کە وا دەکەن خۆمم خۆش بوێت. خەڵکی نوێ هاتونەتە ژیانمەوەو هاوڕێ کۆنەکان گەڕاونەتەوە. ژیان رەهەندێکی نوێی پەیداکردووە ئەمەش هەستێکی زۆر خۆشم دەداتێ.

من و (گرێچین) هێشتا یەکتر نارەحەت دەکەین. جاران لەم حاڵەتانەدا بە بێزارییەوە دەمگوت (ئۆه، نا، دیسان بەزمەکەیە! خۆزگە دەیزانی چۆن رەفتار بکات و لە کۆڵ من ببێتەوە!) بەڵام ئێستا دەڵێم، (باشە، شتێکی دیکە هەیە کە پێویستە فێری ببم. من ئێستا نارەحەتم بەڵام دەزانم چۆن رەفتاری لەگەڵدا بکەم. دەتوانم بچمە دەرەوە و نامەیەکی خۆشەویستی بنوسم یاخود دەتوانم هەندێك کات تەرخان بکەم بچم بۆ پیاسە و کەمێك بیر لە شتەکان بکەمەوەو بێمەوە سەرخۆم.)

هەرچەندە چێژ لە نارەحەتبون و روبەڕوبونەوەی ئەو هەستانە نابینم، بەڵام لەوە دەچێت هەمو جارێك زانیاری نوێ لەبارەی خۆم و هاوسەرەکەم بەدەست بهێنم. لە ئەنجامدا من فێری ئەوە دەبم مەسەلەکە لە خۆم ئاسان بکەم و هیوادارم لە (گرێچین)یش. لە رێگەی تێگەیشتنێکی ئەرێنییەوە لەوەی کە بۆچی جاران ئێمە بە هەڵە لە یەکتری تێدەگەیشتین، دووبارە هیوام بەدەست هێناوەتەوە. ئەمە گەشتێکی سەرسوڕهێنەر بوو.

## هەستێکی باشتر سەبارەت بە خۆم

(رێناتا) ئەمەی باس کرد: تێگەیشتن لەبارەی جیاوازییەکانمان یارمەتی دام هەستێکی باشترم سەبارەت بە خۆیشم هەبێت. لە رێگەی گەڕانەوەمدا لە گەشتێکی (کارۆلانیی باشور) بە دەنگی بەرز بیرم دەکردەوە، باسی ئەوەم دەکرد کە گەڕامەوە ماڵێ پێویستە چی بکەم لە هەفتەی داهاتودا ئینجا لە مانگی داهاتو، ئینجا لە ماوەی سێ مانگداو تا.... تاد.

رستەکەم بەمجۆرە کۆتایی هێنا بەڵێ، و لە شەش مانگی داهاتودا دەبێت بچم بۆلای

پزیشکی ددان؛ ئینجا قسەکەی (جۆن گرەی) سەبارەت بەوەی ژنان چۆن بیر دەکەنەوە هاتەوە بیرم کە نەك تەنیا ژنان بە دەنگی بەرز بیردەکەنەوە بەڵکو بیرکردنەوەکەیان بەرەو دەرەوەش پەرەدەستێنێت. (جۆن گرەی) فێری کردوم کە ئاساییە بەو شێوەیە هەڵسوکەوت بکەم کە هەم.

من چوار کوڕم هەیە، ئەوان سەبارەت بە بیرکردنەوەم بە دەنگی بەرز رەخنەیان لێ دەگرتم— وایاندەزانی بۆڵەبۆڵ دەکەم. بەڵام ئێستا دەزانم کە تەنیا ڤینۆسییەکم و بە دەنگی بەرز بیردەکەمەوە.

## هاوسەرگیرییەکەمان باش بو بەڵام خۆشیی تێدا نەبو

(ئایان) باسی ئەوەی کرد کە چۆن خۆی و هاوسەرەکەی پەیوەندیکردنەکەیان بەرەوپێش بردووە. "دە ساڵ لەمەوبەر (ئێلین) داوای کرد بچین بۆ پشویەکی رۆمانسی کۆتایی هەفتە. من هاوسەرەکەمم زۆر خۆش دەویست، بەڵام جۆرە دوبارەبونەوەیەکم لە ژیانماندا تێبینی دەکرد — لە سێکس کردندا، لە پەیوەندیکردندا، و لە مامەڵەکردندا لەگەڵ مناڵەکانماندا. هاوسەرگیرییەکەمان باش بو بەڵام خۆشی تێدا نەبو. بەلای منەوە وا دەردەکەوت کە پەیوەندییەکەمان گەشەی پێ نادرێت. بێگومان هەمیشە خۆشەویستی و دڵسۆزی هەبو. دەمزانی من تا ماوم هەر (ئێلین) هاوسەرم دەبێت. هەمو شتەکانی دیکە لە گەشەدا بون — کارەکەم و مناڵەکان — بەڵام هاوسەرگیرییەکەمان لەجێی خۆیدا بو. پابەندییەکەی من نەگۆڕ بو، بەڵام لەروی سۆزدارییەوە هەستم دەکرد تانکییەکە بەتاڵ دەبێتەوە.

بۆیە (ئێلین)م قایل کرد واز لە بیرۆکەی پشووەکە بهێنێت و بچین بۆ سیمینارێکی (جۆن گرەی). لە پێنج خولەکی یەکەمدا زانیم کە ئێمە چاکمان کرد هاوسۆزین بۆ ئێوە. (جۆن گرەی) بە باسکردنی هەمو ئەو هەڵانە دەستی پێکرد کە لە پەیوەندییەکانیدا ئەنجامی داون، دەستبەجێ من هەستم کرد بارێکی قورس لەسەر شانم لابراوە. پێویستی نەدەکرد کەسێکی کامڵ و بێ کەموکوڕی بم! پێویستی نەدەکرد بەرپرس بم بەرامبەر کامڵ کردنی پەیوەندییەکە، بەرامبەر دروستکردنی شادمانی بۆ خێزانەکەم. لە دوو خولەکی یەکەمدا، کراوەیییەکەی (جۆن) و باسکردنی لە خۆی وایکرد هەست بکەم باشم.

لـە دور مـەودادا، زمـانێکی شـیرین و پـڕ لـە سـۆزداریم بەدەسـت هێنـا. لایەنـە رۆحـی‌یەکـەم گەشـەی کـرد. لایەنـە جەسـتەیـی‌یەکـەم بـەهێز بـو — مـن مامۆسـتای پـەروەردەی جەسـتەیی بـوم. بـەڵام بەراسـتی زمـانێکی پـڕ لـە سـۆزم نـەبو، هەسـتی وام هەبو کە هەرگیز نەمتوانیبو باسیان بکەم یان دەریانببڕم.

چەند جۆرێکی دیاریکراوی پەیوەندیکردن هەمیشە هەڕەشـەیان لـەو هەسـتی هێـزە دەکـرد کـە مـن وەك پیاوێـك هـەمبو. مـن لاواز بـوم و دەترسـام بـێ ئومێـدی و ناڕەحەتی‌یەکانم دەربڕم چونکە وام دەزانـی ئەگـەر باسـی ئـەو هەسـتانەم بکـەم هـەمو پەیوەندییەکە دەخەمـە مـەترسـی‌یـەوە. وامـدەزانی پێویسـتە هـەمو کاتێـك چارەسـەرم هەبێت بۆ هەمو شتێك و هەمیشە لە کۆنترۆڵی تەواودا بم. پێویستە پیاوێکی بـەهێز بم بۆ ئەو هاوسەرگیرییە، وانی‌یە؟

**وامدەزانی پێویستە هەمو کاتێک چارەسەرم هەبێت**
**بۆ هەمو شتێک و هەمیشە لە کۆنترۆڵی تەواودا بم.**

بەڵام ئەوەی بەلامـەوە سـەیر بـو، بـەهۆی ئـەو ئـامڕازی پەیوەندیکردنانـەی (جۆن) فێـری کـردم، هـەمو شـتێك کرانـەوەو هەسـتم بـە پەیوەنـدیکرد لەگـەڵ خـودی خۆمـدا. هەستم کرد بارێکی قورس لادەچێت و لە هـەمو ئاسـتێکەوە زانیـاری دەڕژێتـە ناخمـەوە هەستم بە ئازادییەك کرد کە ماوەیەکی زۆر دوورودرێژبو هەسـتم پێنـەکردبو؛ هەسـتم کـرد خۆشەویسـتی بەرامبـەر بـە خـۆم و بەرامبـەر هاوسـەرەکەم دوبـارە دەسـت پێدەکاتەوە. هەستم بە هیوایەکی گەورە کرد.

ئایا چی لەپشت ئەو دەستپێکردنەوە مەزنەی هەستەکانەوە بو؟ مـن دواجـار تـوانیم هەستەکانم دەربڕم کە پێشتر هەرگیز باسم نـەکردبون. فێربـوم کـە سـەرەتا بـوار بـدەم بە (ئێلین) قسە بکات. وازم لەوە هێنا هەوڵ بدەم شێوازی هەسـتکردنەکەی بگۆڕم. وازم هێنا هەوڵ بدەم هەمو جارێك چارەسەر بخەمە ڕو. لەبری ئـەوە گـوێم دەگـرت و پاشـان کە تەواو دەبو، باسـی بۆچونەکان و هەسـتەکان و ئەزمونـەکانی خـۆم دەکـرد و ئـەویش

گوێی لێ دەگرتم.

بە کردەوە، کاریگەری ئەو سیمینارە — کاریگەرییەکی هەمیشەیی — ئەوەیە ئێستا کاتێك من و هاوسەرەکەم توشی مشتومڕ دەبین، دەتوانین زۆر خێراتر لە جاران بگەڕێینەوە بۆ خاڵی هاوسەنگی. وەکو جاران بێدەنگ نابم — شێوازەکەی جارانم ئەوە بو بچمە بیرکردنەوەی قوڵەوە و بەپێی مەزاجی خۆم هەڵسوکەوت بکەم و بەردەوام بم لەسەر ئەو جۆرە هەڵسوکەوتە. ئێستا بڕی ئەوکاتەی بەم جۆرە هەڵسوکەوتەوە بەسەری دەبەم بە شێوەیەکی دراماتیکی دابەزیوە. بەهۆی تەکنیکەکانی (جۆن)ەوە، توانیومە بگەڕێمەوە بۆ بۆشاییەکی هاوسەنگ و خۆشەویست بەبێ ئەوەی لە روبەڕوبونەوە بترسم.

**شێوازەکەی جارانم ئەوە بو بچمە بیرکردنەوەی قوڵەوە و بەپێی مەزاجی خۆم هەڵسوکەوت بکەم و بەردەوام بم لەسەر ئەو جۆرە هەڵسوکەوتە.**

بۆ نمونە، ئەگەر (ئێلین) شتێك بکات کە ئازارم بدات، دەتوانم پێی بڵێم نەك وەکو جاران ئەو هەستانە بشارمەوە یاخود دەنگم بەرز بکەمەوە، و هەوڵ بدەم بە توڕەیی زیاتر لە کۆنترۆڵدا بم و شت دەربپەڕێنم. رێگە تازەکە رێزی زیاتری تێدایە، گوێگرتنی تێدایە هەم لە (ئێلین)یش و هەم لە دەنگەکەی ناخی خۆیشم.

کە ئەمە بو بە خوو، بۆم دەرکەوت ئەو شارەزاییە نوێیانەی پەیوەندییکردن بەراستی سەرکەوتو بون. ئەوانە نەخشە رێگایەکیان بۆ دابین کردم کە بیکەمە رێنمایی خۆم لەسەر ئاستی سۆزداری. هەمیشە توانیومە لە ئاستی جەستەیی و ئەقڵانی و پیشەیی‌یەوە ئەم کارە بکەم، بەڵام ئێستا رێگەیەکم لە ئاستی سۆزدارییشدا بەدەست هێناوە.

ئەمە کاری کردە سەر هەمو شتەکان. ئێمە زۆر لەیەکتر نزیکبوینەوە، پەیوەندیکردنەکەمان چەند قات زیاد بو، هەروەها ژیانی سێکسیمان بە شێوەیەك گەشایەوە کە گەیشتەوە سەردەمی سەرەتا — تا ئێستاش بەردەوامە. بەڵام

چاوەڕواننەکراوترین کاریگەری ئەو شارەزاییە نوێییەی گوێگرتن و تێگەیشتن لە جیاوازییە رەگەزییەکان، ئەوەیە لەگەڵ کوڕ و کچەکەمدا هاتونەتە ناو پەیوەندییەکەمەوە.

**کە بوم بە باوک، سەبر و هاوسۆزی و ئامادەیی پشتیوانیکردم زیادی کرد.**

لەبەرئەوەی من زۆر لێبوردەم بەرامبەر بە خۆم و بەرامبەر بەو هەڵانەی کە وەك پیاوێك و وەك باوكێك ئەنجامم داون، سەبرم لەگەڵیاندا زیادی کردووە و هاوسۆزییم زیاترە، زیاتر پشتگیرییان دەکەم. لەبەرئەوەی لە ئێستادا لەروی سۆزدارییەوە پشتگیری خۆم و هاوسەرەکەم دەکەم، دەتوانم ئەو پشتگیرییە بۆ مناڵەکانیشم بخەمەرو. پێش ئەوە، من رێگەیەکی دیکتاتۆرانەترم بەرامبەریان گرتبووە بەر، وامدەزانی لە بنەوە هەمیشە خۆشەویستی لەخۆ دەگرێت. بەم هۆیەشەوە، ئێستا منالەکانم تا رادەیەکی زۆر دەربڕی هەستەکانیانن و لەگەڵ هاوڕێ و کەسانی گەورەدا زۆر ئاسودەن — زۆر لە من ئاسودەترن لە هەمو قۆناغەکانی تەمەنمدا. زۆرم پێخۆشە کە دەبینم سود لە ئەزمونەکانی من لەم کارەدا وەردەگرن.

ئێمە کۆبونەوەی بەردەوامی خێزانییمان هەیە، ئەگەر کێشەیەك روبدات، ئێستا رێگەمان هەیە بۆ چارەسەرکردنیان. لەسەر بنەمای تەکنیکەکانی (جۆن) بۆ گوێگرتن، هەمو کەسێك گوێی لێ دەگیرێت. هەمو کەسێك لە هەمو کاتێکدا دەتوانێت داوای کۆبونەوەیەکی خێزانی بکات بۆ دەربڕینی بیروبۆچونەکانی، منالەکان ئەم کارە دەکەن. لەراستیدا گەشەی پێدەکەن.

"کەواتە، دەبینیت، ئێمە شتێکمان هەیە پێیان ببەخشین: رێگەکانمان بۆ پەیوەندیکردن دیارییە راستەقینەکانمانن بۆ منالەکانمان. ئەوان دەمانبینن پەیوەندی دەکەین و گەشە دەکەین، مشتومڕ دەکەین بەلام ئاشت دەبینەوە و داوای لێبوردن دەکەین، پابەندیین بەیەکترەوە بۆ ئەوەی پەیوەندییەکەمان سەربخەین، بە باشی گوێ لەیەکتری دەگرین. دەزانین کە هەمو ئەو کاتەی کە بە یەکتری دەبەخشین، بە منالەکانیشمانی دەبەخشین."

## خۆشەویستی لە یەکەم نیگاوە

(ئـێلین) لایەنەکـەی خـۆی گێڕایـەوە. "مەسـەلەکە بیسـت سـاڵ لەمەوبـەر دەسـتی پێکرد. ئەوکاتە تەمەنم تەنیا بیستوچوار ساڵ بـو، تـەنیا سـێ هەفتـە بـو ئـەم پیـاوەم دەناسی و بڕیارم دابو شوی پێبکەم. سێ مانگ دوای ئەوە هاوسەرگیرییمان کرد.

ئێمە لەراستیدا زۆر لەیەکتر دەچوین. (ئایان) تەمەنی چواردەساڵ بـووە کـە دایـك و باوکی لەیـەکتر جیابوبونەتـەوە و منـیش لـە تەمـەنی یـانزە ساڵیدا بـاوکم مردبـو. بـەم شێوەیە هەردوکمان یەك بەخێوکەر گەورەی کردبوین.

سێ ساڵی یەکەممان خۆش بو. منداڵمـان بـو، حـەوت سـاڵ دوای هاوسـەرگیرییەکەمان، واتــەدوای دە ســاڵ، ئێمــە زۆر سێکســمان نــەدەکرد، منــیش هەمیشــە تــوڕە بــوم. پەیوەندییەکەمان زۆر ژیانی تێدا نەبو، هەرچەندە ئێمە پێوەی پابەند بوین.

**دوای دە ساڵ، ئێمە زۆر سێکسمان نەدەکرد، منیش هەمیشە توڕە بوم.**

(ئایان) بڕیاری دا کە ئێمە پێویستمان بەوەیە بەشداری سیمینارێکی (جۆن گـرەی) بکەین. لەراستیدا من دەترسام. لەوە دەترسـام کـە سـیمینارەکە بۆمـان دەربخـات هـەرکام لە ئێمە هاوسەرێکی هەڵەی هەڵبژاردووە، واتە بۆم دەربکـەوێت کـە مـن (ئایـان)م خـۆش ناوێت یاخود ئەو منی خۆش ناوێت.

ئەوەی رویدا پاکبونەوەیەکی رۆحیی راستەقینە بو. فێری ئـەو ئامرازانـە بـوین کـە توانامـان پێدەبەخشێت لـەم پەیوەندییەمانـدا بمێنینـەوە. سـەرەکیترین ئـامراز بـۆ مـن وەکو ژنێك ئەوەبو کە ببمە کەسێکی لاوازتر (ناسکتر). من بۆم دەرکـەوت کـە لـە لایەنـە نێرینەکـەی ژیانـدام — هەمیشـە بایـەخم دەدا بـە چارەسـەرکردنی کێشـەکانی خـەڵکانی دیکە و پێویستی و هەستەکانی خۆمم پشتگوێ دەخست. (جۆن) نیشانی دایـن کـە چـۆن ژن پێویسـتی بـە قسـەکردن و قسـەکردن و قسـەکردنە و چـۆن ئەمـە بـۆ ژن رێگەیـەکی سروشتییە.

دووەم مەسەلە کە بۆ من زۆر بەسود بون، ئەوەبو کـە لـەو سـیمینارەدا سـەبارەت بـە

هەستەکانم لەبارەی لەدەستدانی باوکمەوە توشی داڕوخانێکی گەورە بووم. من لەوەوپێش ئەو هەستانەم نەبووە، کەچی دەستم کرد بە گریان، (جۆن) منی بینی کە دەگریام و بانگی کردمە پێشەوەی ژوورەکە. داوای لێ کردم ئایا دەتوانم هەستەکانم دەربڕم، ئەمە گەشەی کردو بوو بە پاکبونەوەیەکی رۆحیی لەو هەستەی کە پیاوان بەجێیان هێشتوم، کە ناتوانم متمانە بە پیاو بکەم، هەستکردنم لەوەی کە ناوێرم لە بەرامبەر پیاواندا خۆم لاواز نیشان بدەم. (جۆن) (ئایان)ی بانگ کرد داوای کرد هەر کاتێك هەستی خۆم بەرامبەر باوکم دەربڕی گوێم لێ بگرێت. ئەزمونێکی سەخت و دژواربو بۆ من کە ڕێگە بدەم (ئایان) ئەمە ببینێت.

ژنان ئەگەر تەنیا بتوانن متمانە بە پیاوان بکەن و فێریان بکەن هەوڵی چاککردنەوەیان نەدەن بەڵکو تەنیا هەر گوێیان لێ بگرن؛ ئەوا دڵمان بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەکرێتەوە و هەست بە نزیکییەکی زیاتر دەکەین لەگەڵ ئەو پیاوانەدا. ئەمە بەسەر مندا هات. ئەم ئەزمونە هەمو پەیوەندییەکەمانی گەشە پێدا؛ ژیانی جەستەییمان، هۆگریمان، و پەیوەندییمان لەگەڵ منداڵەکاندا گەشەیان کرد. وازمان لەوە هێنا منداڵەکانمان بخەینە نێوانمانەوە بۆ ئەوەی خۆمان لەیەکتر دوربخەینەوە.

---

**ئامرازمان هەیە بۆ دەربڕینی پێویستییەکانمان، هەست و، حەز و، ڕقەکانمان، هەروەها خۆمان بپارێن، شتەکان زۆر نەهێنینە سەرخۆمان.**

---

بەبێ سیمینارەکەی (جۆن) نازانم دەگەیشتینە کوێ. بەهۆی ئەو سیمینارەوە ئێمە هاوبەشی ژیانی یەکترین. ئامرازمان هەیە بۆ دەربڕینی پێویستییەکانمان، هەست و، حەز و، ڕقەکانمان، هەروەها خۆمان بپارێن، شتەکان زۆر نەهێنینە سەرخۆمان. ئەو شێوازە ڕێگەمان پێدەدات بەهۆی خۆشەویستییەوە بتوانین یارمەتی یەکتر بدەین و هەوڵ بدەین پشتگیری یەکتر بکەین لەو شتانەدا کە داوایان دەکەین و هەستیان پێ دەکەین.

چۆن یەکتر دڵخۆش دەکەین؟ هەردوکمان هەوڵ دەدەین رۆمانسیی بە زیندویی بهێڵینەوە. ئێمە کارکردن لە پەیوەندییەکەماندا لە پێشەوەی ریزبەندییەکانماندا دادەنێین بەوەی کات تەرخان دەکەین کە بە خۆشی پێکەوە بیبەینە سەر. کات تەرخان

دەکەین دور لە منالەکان بۆ ئەوەی بە رۆمانسی بیبەینە سەرو کات تەرخان دەکەین دور لە یەکتر بۆ ئەوەی کارەکانی خۆمان ئەنجام بدەین. کاتێك دەگەڕێینەوە بۆلای یەکتر، بیری یەکتری دەکەین و شتی زیاترمان هەیە بیانخەینە رو.

سەبارەت بەوەی من چی دەکەم بۆ (ئایان) تا دڵخۆشی بکەم، باشە، ئەو پێویستی بەوەیە متمانەی پێبکرێت. بۆیە من خۆم بەدور دەگرم لەوەی ئامۆژگاری و پێشنیاری بۆ بخەمەڕو مەگەر خۆی داوای بکات. هەوڵ دەدەم هەر کاتێك بتوانم و بەرامبەر هەر کارێك کە دەیکات بینرخێنم.

(ئایان) چی دەکات بۆ ئەوەی من دڵخۆش بکات؟ گوێ دەگرێت. لەبەر من بایەخ بە شتە بچوکەکان دەدات. هەمو بەیانییەك کوپێك چام بۆ دەهێنێت. زۆر بەشداری دەکات لە بەخێوکردنی منالەکاندا. بەڵام گەورەترین شت رێزە ئەفسانەییەکەیەتی بۆ من. ئەو ستایشم دەکات و چاوەڕوانی ئەوە لە منالەکانمان دەکات ئەوانیش هەمان شت بکەن. ئەمە ئەو رێگایانەن کە ئێمە یەکتریی پێ دڵخۆش دەکەین.

## قسەکەرەکان و بیرکەرەوەکان

ئەمە چیرۆکی (سوزان)ە. من تەمەنم چل و حەوت ساڵەو ماوەی دە ساڵیشە هاوسەرگیرییم کردووە. من و (ریچ)ی هاوسەرم دوانزە ساڵە یەکتری دەناسین و منالمان نییە.

لە ماوەی چەند ساڵی یەکەمی هاوسەرگیرییەکەماندا وام هەست دەکرد کە پەیوەندیکردن لە نێوانماندا وەك پێویست نییە. لە ماڵەوەدا من (قسەکەر)ەکە بوم و (ریچ) بیرکەرەوەکە بو.

جار لەدوای جار هەوڵم دەدا وای لێ بکەم بکرێتەوە و بیرکردنەوە و هەستەکانیم بۆ باس بکات، بەڵام بێ ئەنجام بو. من پێشتر هاوسەرگیرییەکم کردبو کە هیچ نزیکی و خۆشەویستیەتی تێدا نەبو، بۆیە سوربوم لەسەر ئەوەی ئەم هاوسەرگیرییە جیاواز بێت — ئەگینا ئەمیش بە دڵنیاییەوە شکست دەهێنێت.

وەکو زۆرێك لە کەپلەکان، ئێمە نەمانەدەزانی چۆن خۆمان دەربڕین. (ریچ) نەیدەزانی چۆن هەستەکانی خۆی بە وشە دەربڕێت و منیش نەمدەزانی کام وشانە بەکاربهێنم بۆ ئەوەی وا لە (ریچ) بکەم بکرێتەوە. خۆمم لەوەدا بینییەوە کە زیاتر و

زیاتر توڕە و بێزار دەبم: هاوسەرگیرییەکەمان پێکەنینی تێدا نەمابو.

**هەر کە دەمویست دەست بکەم بە قسەکردن، دەمبینی بێدەنگ دەبێت و دەچێتە باری بەرگری لەخۆکردنەوە.**

تەماشای بەرنامەکەی (ئۆپرا)م دەکرد و ئەو بیرۆکانەم لێوە وەردەگرت کە چۆن پەیوەندییەکی باشتر بکەین؛ پاشان کە (ریچ) دەگەڕایەوە هەوڵم دەدا تەکنیکەکانی بۆ روون بکەمەوە. هەر کە دەمویست دەست بکەم بە قسەکردن، دەمبینی بێدەنگ دەبێت و دەچێتە باری بەرگری لەخۆکردنەوە. بەرگری لەخۆکردنەکەی بەلای منەوە تەواو سەخت بو، نەمدەزانی چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکەم. مشتومڕێکی بەدوادا دەهات. پاشان ئەو هەوڵێکی بچوکی دەدا بۆ ئەوەی ماوەی یەك دوو هەفتە باشتر ببێت و پاشان رێك دەگەڕایەوە بۆ ئەو شوێنەی دەستمان پێکردبو.

جگە لە بەرگریکارییەکەی (ریچ)، نیگەرانیی سەرەکیم ئەوەبو من هەستم دەکرد سودم لێ وەردەگرێت لەبری ئەوەی خزمەت دەکرێم. من لە ژیانمدا پیاوێکم دەویست کە جارجار شتەکان کۆنترۆڵ بکات. کەچی وام هەست دەکرد بە کردەوە خۆم گەورەی ماڵم، هەمو کارەکانی رۆژانە دەکەم، هەمو نیگەرانییەکان بۆ منە و لە بەرامبەریشدا تەنانەت سوپاسێکیش ناکرێم. پەستبونەکەم خەریکبو کەڵەکە دەبو. (ریچ) بەردەوام جلی ژێرەوەی ئامادەکراوی لە کەنتۆرەکەیدا هەبو. ئەی بۆچی من نەمدەتوانی کەنتۆرەکەم بکەمەوە و جلی ئامادە هەبێت لەبری بکەم؟ وام هەست دەکرد خۆشەویستیی لەنێوان من و هاوسەرەکەمدا نەماوە و نەمدەزانی روبکەمە کوێ.

خویەکی ناشرین دروست دەبو. چەند هەفتە جارێك، کاتێك شتەکان لە وزە دەردەچون، هەوڵم دەدا بۆی رون بکەمەوە کە هەست بە چی دەکەم، بەڵام تەنیا دەمتوانی بگریم. پەیمانی دەدا کە کاری زیاتر بکات لە ماڵەکەدا؛ و دیسان، تەنیا هەفتەیەك یان دوان بڕی دەکرد.

پاشان من کتێبەکەی تۆم بەر گوێ کەوت، (پیاوان لە مەریخەوە هاتون و ژنان لە ڤینۆسەوە). کاتێك من کتێبەکەم دەخوێندەوە بیستم تۆ لە شاری (نیویۆرك)

سیمینارێکت هەیە. داوام لە (ریچ) کرد ئاخۆ دێت، ئەویش هات. ئەوە باشترین شت بو کە تا ئێستا لێمان روی دابێت!

کاتێك تۆ قسەت دەکرد، هەستی دەکرد قسەکانی منن لە دەمی تۆ دێنە دەرەوە. لە هەمو ئەو شتانەدا خۆمان بینییەوە کە تۆ باست کردن. لە هەموشی گرنگتر ئەوەبو تۆ باسی ئەو شتانەت کرد کە ژنان زۆریان پێخۆشە – خۆڵڕشتن، قاپشتن، قەدکردنی جلوبەرگ و .. تاد. (ریچ) بەمە سەرسام بو، وابزانم زۆربەی پیاوان سەرسام ببن. لە گەڕانەوەماندا بەرەو ماڵەوە باسی سیمینارەکەمان کردو لەو شەوەوە پەیوەندییەکەمان گۆڕاوە.

**کاتێک تۆ قسەت دەکرد، هەستی دەکرد قسەکانی منن لە دەمی تۆ دێنە دەرەوە. لە هەمو ئەو شتانەدا خۆمان بینییەوە کە تۆ باست کردن.**



ئێستا (ریچ) بەبێ ئەوەی داوای لێ بکرێت خۆڵەکە دەباتە دەرەوە، سەتڵی ریسایکلێنەکە دەباتە قەراخ جادەکە، قاپەکان دەشوات، جلەکان قەد دەکات، بە گسکی کارەبا ماڵەکە گسك دەدات؛ هەمو پسوڵەکان خەرج دەکات و .. تاد. منیش سوپاسی دەکەم کە ئەم شتانەم بۆ دەکات.

ئێمە پەیوەندییکردنەکە بە کراوەیی دەهێڵینەوە، بەڵام ئەمە کاری دەوێت .. هەرگیز لەخۆوە رونادات. ئەو کات تەرخان دەکات گوێم لێ بگرێت، ئەگەرچی حەزیشی لێی نییە. ئەگەر دەموچاوی (ریچ) بخوێنمەوە و بزانم شتێکی لە مێشکدایە، یاخود شتێکم وتبێت کە پێی خۆش نەبوبێت، هانی دەدەم پێم بڵێت کە بیر لە چی دەکاتەوە. خۆ ئەگەر حەزی نەکرد قسە بکات، نایخەمە ژێر گوشارەوە. لەگەڵ ئەوەشدا وا پێم وابێت لەبەر ئەوەی هەست بە گوشار ناکات زۆر زیاتر ئامادەیە باسی ئەو شتە بکات کە روودەدات.

**هانی دەدەم پێم بڵێت کە بیر لە چی دەکاتەوە.**
**خۆ ئەگەر حەزی نەکرد قسە بکات، نایخەمە ژێر گوشارەوە.**

ئێمە هەمو رۆژێك بە یەكتر دەڵێین (خۆشم دەوێیت). ئێمەماڵەكە جێناهێڵین یاخود نایەینە ماڵەوە ئەگەر ماچی خواحافیزی یان هاتنەوەی یەكتری نەكەین. یەكێك لەو شتانەی (ریچ) بەردەوام ئەنجامی داوە لەوەتەی بینیومە ئەوەیە رۆژانە لانی كەم جارێك تەلەفۆنم بۆ دەكات و كاتی گەڕانەوەكەیم پێدەڵێت.

ئەمە شتێكم بیر دەخاتەوە كە رۆژێكیان روی دا. من خەریكی ئامادەكردنی شیرینی بوم بۆ كریسمس و بە هەڵە دوو ئەوەندەی بڕی پێویست سۆدەم تێكرد. دەستم كرد بە برژاندن و یەكەم دەستە شیرینی تامی ناخۆش بو. ناچار بوم هەمو هەویرەكە فڕێ بدەم و لەسەرەتاوە دەست پێبكەمەوە. هێندەش كەرەسەم نەبو كە بڕێكی تر دروست بكەم، بۆیە ناچار بوم بچم بۆ كۆگاكە.

پێش ئەوەی بڕۆم لە (ریچ)م پرسی كە ئایا كە گەڕامەوە یارمەتیم دەدات و ئەویش گوتی "بۆچی سبەینێ نایكەیت؟" دوبارە ئەمە ئەو وەڵامە نەبو كە من بۆی دەگەڕام. هیچم نەگوت و چوم بۆ كۆگاكە. دوای دە خولەك كە گەڕامەوە لەوەدەچو كەمێك بیری لەو وەڵامە كردبێتەوە كە پێی گوتبوم، چونكە لەبەردەرگاكە گرتمی و پێی گوتم "یارمەتیت دەدەم. تەنیا پێم بڵێ دەتەوێت چیت بۆ بكەم."

هەستی دڵخۆشییەكی تەواو دایگرتم. ئەگەر دوو ساڵ لەمەوبەر بوایە، ئەو لەسەر كورسییەكەی دادەنیشت و منیش خەریكی ئیش دەبوم.

**دوو ساڵ لەمەوبەر ئەو لەسەر كورسییەكەی**
**دادەنیشت و منیش خەریكی ئیش دەبوم.**

وەك پێشتر گوتم، ئەمە كاری بەردەوامی دەوێت. خووە خراپەكان بە سەختی لەناودەچن. ئەوەی ئەوەندە دڵخۆشم دەكات ئەوەیە ئێستا هەردوكمان بە راستی كاردەكەین بۆ ئەوەی یەكتری دڵخۆش بكەین. ئەگەر بە شێوەیەكی بێمەبەست كارێك بكەین ئەوی تر ناڕەحەت یان تورە ببێت، ددان بەوەدا دەنێین كە هەڵە بوین، داوای لێبوردن دەكەین و چارەسەری دەكەین.

**ئێستا لە هەمو کاتێکی دیکە زیاتر دڵخۆشین و**

**بەردەوام بەرەو چاکتر بون دەڕۆین.**



# ٥
# مەریخی‌یەکان بەرێوەن

بۆ پێشکەشکردنی سیمینارەکانم لەکاتی گەشتکردنمدا بە وڵاتدا، چیرۆکی ئەو کەپڵانە کاریگەریی قوڵم لەسەر بەجێ دەهێڵن کە جیابونەتەوەو تەنانەت ئەوانەش کە هاوسەرگیرییەکەیان هەڵوەشاندۆتەوە، بەڵام پاش خوێندنەوەی کتێبەکانی من لە پەیوەندییەکی خۆشەویستنانەدا یەکیان گرتۆتەوە. هەرچەندە بیستنی ئەم جۆرە چیرۆکانە لە بەشدارانی سیمیناری پەیوەندییەکانم دەگمەن نییە، بەڵام هەرگیز باوەڕم نەکردووە کە تەنیا خوێندنەوەی یەکێك لە کتێبەکانم و جێبەجێکردنی بیرۆکەکانی بتوانێت کاریگەرییەکی لەم جۆرەی هەبێت.

ئەمە شتێکی سەرنجڕاکێش و ئیلهامبەخشە، بەتایبەت بۆ ئەم سەردەمەی ئێستا بەم هەمو جیابونەوەیەی کە هەیە چیرۆکی ئەو مەریخی و ڤینۆسیانە ببیستیت کە گەڕاونەتەوە بۆ خۆشەویستی. لە سازکردنەوەی پەیوەندیەکی بریندارا یاخود لە بەهێزکردنی پابەندی بۆ هاوسەرگیریدا، بەگشتی کۆمەڵە هۆکارێکی زۆر لە کاردان، کە رەنگە زۆر ئاڵۆز بن. بەڵام ئەوکاتە لە جیاوازییەکانی نێوان ژن و پیاو تێدەگەیت.

## پیاوان چۆن لە خۆشەویستیدا گەشە دەکەن

پیاوان لە ئەنجامی نزیکبونەوە و ئینجا پاشەکشەکردندا لە خۆشەویستیدا گەشە دەکەن. پیاو وەکو لاستیك دەگەڕێتەوە بۆ دواوە پێش ئەوەی دواجار بگەڕێتەوە پێشەوە. وتە بەناوبانگەکەی کە دەڵێت: "دووریی وا دەکات دڵ دۆستایەتی زیاد بکات." بەراستی گوزارشت لە توانای پیاو دەکات بۆ خۆشەویستی. لەم بەرەوپێش و بەرەودواوە چوونەدا، پیاو وردە وردە لە خۆشەویستیدا گەشە دەکات. جار لەدوای جار، ژنان بۆیان دەرکەوتووە کە دەستبەرداربون لە پیاوان وایان لێ دەکات میهرەبانتر لە جاران بگەڕێنەوە.

"دووریی وا دەکات دڵ دۆستایەتی زیاد بکات."
بەراستی گوزارشت لە توانای پیاو دەکات بۆ خۆشەویستی.

کە پەیوەندییەك کۆتایی دێت، یاخود کە رەنگە بەشێوەیەکی هەمیشەی کۆتایی هاتبێت، پیاو هەندێك جار ئەو دوورییە بەدەست دەهێنێت کە پێویستێتی تا بۆی دەربکەوێت چەند هاوبەشەکەی خۆش دەوێت؛ پاشان دوبارە هان دەدرێتەوە کە لەسەرەتاوە دەست پێدەکاتەوە. هەمو ئەوەی پێویستی پێیە تێگەیشتنە لەوەی چ هەڵەیەك رویداوەو چۆن چارەسەر دەکرێت. لەگەڵ ئەمەشدا، بەبێ ئەم تێگەیشتنە، رەنگە رێگە بە خۆی نەدات بگەرێتەوە.

زۆربەی پیاوان پەشیمانن لە کۆتایهاتنی پەیوەندییەکە بەڵام خۆیانی بۆ بەدەستەوە دەدەن چونکە نازانن چ هەڵەیەك رویداوە. پیاو کاتێك لە پەیوەندییدا کۆڵ دەدات کە هەست بکات ناتوانێت ژنەکە دڵخۆش بکات. لەگەڵ ئەمەشدا، تێگەیشتنی بنەرەتی لەبارەی هەسارەی مەریخەوە بەسە بۆ ئەوەی بزانێت چ هەڵەیەك رویداوە و چۆن چارەسەری بکات. ئەم تێگەیشتنە رێگەی پێدەدات بۆ دووبارە پابەندکردنەوەی خۆی بۆ سەرخستنی پەیوەندییەکە.

## چۆن ژنان لە خۆشەویستیدا گەشە دەکەن

ژنان لە خۆشەویستیدا گەشە دەکەن ئەگەر هەست بکەن دەتوانن ئەو خۆشەویستییە بەدەست بهێنن کە پێویستیانە. بەڵام ئەگەر پەیوەندییکردنەکە دابروخێت وازی لێ دەهێنن. وەکو شەپۆلێك، ژنەکە بەرەو خوار دەبێتەوە بەڵام ناتوانێت دوبارە لە خۆشەویستیدا بەرز ببێتەوە. بەبێ گەشەپێدانی پەیوەندی، ژنەکە هەست بەوە دەکات خۆشیان ناوێت. بە تێپەربونی کات هەست بەوە دەکات کە هەمو بەخشینەکە ئەو ئەنجامی دەدات و ئەو شتەش بەدەست ناهێنێت کە پێویستیی پێیەتی. لەئەنجامدا، دەست دەکات بە زویرکبوون لە هاوبەشەکەی. ژنەکە هەست دەکات کە هیچی دیکەی نەماوە بیبەخشێت و لەبەر ئەوەی خۆیشی بێدەسەڵاتە بەرامبەر بە پێویستییەکانی، دەروات و بەجێی دەهێڵێت.

ژنەکە تا زیاتر لە هاوبەشەکەی برەنجێت زیاتر هەست بەوە دەکات کە کاتێکیش لە مێردەکەی جیادەبێتەوە، ئازادە هەست بکات کە بەرپرسیارە لە تێرکردنی

پێویستییەکانی خۆی. ئەگەر ژنەکە هەلی ئەوەی هەبێت پێویستییەکانی لە ڕێگەی هاوڕێکانی و خێزانەکەیەوە بەدەست بهێنێت، شەپۆلەکە بەرز دەبێتەوە و ژنەکە دووبارە هەست بە خۆشەویستییەکانی دەکاتەوە.

بە ڕێگەیەکی تەندروست، ژنەکە دەتوانێت پێویستییەکانی خۆی لە ڕێگەی هاوڕێکانی‌یەوە تێر بکات و بۆی دەربکەوێت کە بەبێ هاوبەشەکەشی دەتوانێت دڵخۆش بێت. هەستکردن بە سەربەخۆیی و بڕوا بەخۆبون ژن بۆ لێبوردن و لەبیرکردن ئازادتر دەکات. پاشان، بە تێگەیشتنێکی نوێوە کە چۆن دەتوانێت ئەوەی لە پەیوەندییەکدا پێویستییەتی بەدەستی بهێنێت، دڵی دەتوانێت دووبارە بەڕوی خۆشەویستی و متمانەکردندا بکرێتەوە.

لە هەزاران حاڵەتدا، تێگەیشتنی سەرەکی (پیاوان لە مەریخەوە هاتون) یارمەتی ژنانی داوە خەتای خۆیان لە کێشەکەدا ببیننەوە کە ئازاری پەیوەندییە شکستخواردووەکان دەدات. بۆیان دەردەکەوێت کە زیاتر لەوەی بڕوایان دەکرد خۆشویستراون. بەم زانیارییە قوڵترەوە دەربارەی پیاوان، ژنان هەست بەو بێ دەسەڵاتییە زۆرە ناکەن بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتوانەی ئەو خۆشەویستی و پشتگیرییەی کە بۆ بەردەوامیدان بە بەخشین و خۆشویستن پێویستیانە. هاوکات لەگەڵ هەستێکی تەندروستی بەرپرسیارێتی‌دا، ئەم متمانە تازە دۆزراوەیە چەندین هاوسەرگیریی ڕزگار کردووە.

**هەستکردن بە سەربەخۆیی و بڕوا بەخۆبون ژن بۆ لێبوردن و لەبیرکردن ئازادتر دەکات.**

بۆ زوربەی ژنان، بیرۆکەکانی (پیاوان لە مەریخەوە هاتون) بەس بون بۆ ئیلهامبەخشین پێیان کە دوبارە خۆشەویستی بدۆزنەوە. زۆر جار ژن بۆی دەردەکەوێت کە خۆشەویستییەکەی بەرامبەر بە هاوبەشەکەی دەست پێدەکات و لە جاران بەهێزتر دەگەڕێتەوە. ژنەکە بۆی دەردەکەوێت کە مەسەلەکە ئەوە نی‌یە پیاوەکە خۆشی ناوێت، بەڵکو مەسەلەکە خەتای ئەوەیە کە پیاوەکە لە مەریخەوە هاتووە و نەیزانیوە چۆن ئەو خۆشەویستییەی

پێببەخشێت کە ژنەکە پێویستی پێبووە. ژنەکە لە ڤینۆسەوە هاتووە و نەیزانیوە چۆن هەست و بیرکردنەوەی پیاوان جیاوازن.

## تەحەداکەی خۆشەویستی

لەدوای ئامادەبونە نوێکراوەکەی پیاو بۆ دابینکردنی ئەو پشتگیرییەی کە ژن پێویستێتی یاخود تێگەیشتن لەوەی کە ژن دەتوانێت ئەو پشتگیرییانە بەدەست بهێنێت کە پێویستی پێیانە، هەزاران کەپڵ لە خۆشەویستیدا یەکیان گرتۆتەوە. چیرۆکەکانیان بەراستی ئیلهامبەخشن چونکە قسە بۆ بالاترین بەشی ئێمە دەکەن: ئەو بەشەی ناخمان کە بە غەریزە دەزانێت مەبەستە راستەقینەکەمان لەم گەشتەماندا بە جیهاندا بریتییە لەوەی خۆشەویستی بدۆزینەوە و خۆشەویست بین. ئەمە تەحەداکەی ئێمەیە؛ بەدەستهێنانی ئەمە هەمو ئەو شتانە دەگەڕێنێتەوە کە لە کۆنەوە مرۆڤبونی ئێمەیان باش و مەزن کردووە. سەرکەوتنی ئەم کەپلانە ئاوێنەی ئێمەیە هەر کاتێک خۆمان پابەند بکەینەوە بە خۆشەویستییەوە. هەرچەندە هەندێ لەم چیرۆکانە باس لەو کەپلانە دەکات کە دوای جیابونەوە و یاخود هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیری دەگەڕێنەوە بۆلای یەکتر، هەمان ئەم بنەمایانە جێبەجێ دەکرێن هەرکاتێك هەنگاوێك زیاتر لە خۆشەویستی نزیکدەبینەوە.

## رقی لێ بوو و رۆژێك بەجێیهێشت

(ئانێت) بە چاوی فرمێسکاوییەوە چیرۆکەکەی خۆی گێڕایەوە: ئێمە لەیەکتر جیابوبوینەوە و رۆژێکیان (بروس)ی هاوسەرم کتێبەکەی تۆی خوێندەوە. ناتوانم بۆ تۆی دەربڕم کە ئێستا چەند دڵخۆشین. ئێستا کچێکی منالمان هەیە و زۆر دلمان خۆشە. ئێمە چەندین ساڵ مشتومڕمان بو. ئەو لە هێڵی ئاسمانی کاری دەکرد و کاتێکیش کە دەگەڕایەوە خۆی دورەپەرێز دەگرت. من هەمیشە هەولم دەدا لە رێگەی قسەکردنەوە لەیەکتر نزیك ببینەوە. ئەو رقی لێ بو دواجار رۆژێکیان هەستا رۆی.

شەش مانگ دوای جیابونەوەکەمان، کتێبەکەی تۆی خوێندەوە. تەلەفۆنی بۆ کردم و باسی مەسەلەی ئەشکەوتەکەی بۆ کردم و ئینجا گوتی کە بۆی دەرکەوتووە بۆچی

قسەکردن بەلای منەوە ئەوەندە گرنگ بووە. زۆری بیر دەکردم، بەڵام نەیدەزانی چی بکات. کتێبەکەی تۆ ئەو بوێرییەی پێبەخشیبو کە دوبارە تاقی بکاتەوە. ئێمە بەردەوام گوێ لە کاسێتەکانت دەگرین و کتێبەکانت دەخوێنینەوە. ئێمە زۆر سوپاسگوزارین کە هاوسەرگیرییەکی شادمانمان هەیە.

## من خۆشم دەویست بەڵام عاشقی نەبوم

(تۆم) گێڕایەوە: ئێمە بیست و سێ ساڵ بو هاوسەرگیریمان کردبو. من (کریستن)م خۆش دەویست بەڵام عاشقی نەبوم. هەرگیز نەماندەویست ئازاری یەکتر بدەین بەڵام لەگەڵ یەکتردا دڵخۆش نەبوین. هەمو شتێك بێ رەنگ و بۆ بو. هیچ شتێك نەمابو باسی بکەین. دەمویست بەبێ قرە جیاببینەوە بێت. هەرچەندە سەردانی چەند راوێژکارێکمان کردبو، ئەو داوای کرد بەشداری سیمینارێکی (جۆن گرەی) بکەین تەنیا بۆ ئەوەی بزانین ئایا هیچ شتێك هەیە بتوانین بۆ رزگارکردنی هاوسەرگیرییەکەمان ئەنجامی بدەین یان نا.

من دڵنیابوم کە جیابونەوەکەمان مسۆگەرە، بەڵام بۆ ئەوەی دڵخۆشی بکەم رەزامەندییم دەربڕی. لە کاتژمێری یەکەمدا ئەقڵم گۆڕا. بڕوام بە گوێی خۆم نەدەکرد. تۆ باسی پەیوەندییەکەی بیستوسێ ساڵی رابردوی ئێمەت دەکرد. تەنیا جیاوازییەکەی ئەوەبو ئێستا لێی تێدەگەیشتم. من زۆردەمێك بو هەوڵم دەدا هاوبەشێکی بەسۆز بم، بەڵام نەمدەتوانی ئەوە بە خۆم ببەشخم کە پێویستم پێبو.

من لە دڵی خۆمدا وام هەست دەکرد کە هیچ شتێك نییە بتوانم بیکەم بۆ ئەوەی (کریست) دڵخۆش بکەم. وەکو زۆربەی پیاوان منیش وام دەزانی دەبێت کێشەکانی چارەسەر بکەم و نەمدەزانی ئەو تەنیا پێویستی بەوەیە هەست بکات گوێی لێ دەگرم و دڵنیای بکەمەوە لەوەی کە بایەخی پێ دەدەم. من جاران ساردبوم چونکە هەرچییەکم دەگوت بێ سود بو.

**من جاران ساردبوم چونکە هەرچییەکم دەگوت بێ سود بو.**

لەو ماوە درێژەی رابردودا ئەو دەستی کرد بە هەڵپرۆکان. هەمیشە دەیگوت کە منی خۆش دەوێت، بەڵام وا دەردەکەوت هەرچییەکی بۆ بکەم ئەو بە کەمی دەزانێت. ئێستا تێدەگەم بۆچی: گوێم نەدەگرت هەمیشە گلەیی ئەوەی هەبو کە پێکەوە قسە ناکەین بەڵام هیچ بابەتێك نەبو قسەی لە بارەوە بکەین. ئێستا دۆخەکە گۆڕاوە. دەتوانین قسە لەبارەی هەمو شتێکەوە بکەین چونکە ترسی ئەوەمان نییە ئازاری یەکتری بدەین. دەتوانین بە تێگەیشتنێکی زیاترەوە باسی هەستەکانمان بکەین. من فێری ئەوەبوم کە زیاتر گوێ بگرم و ئەویش زۆر دڵخۆشترە. ئێمە دوبارە عاشقی یەکترین و هیواداریین بە درێژایی ژیانمان هەر عاشقی یەکتری بین.



### بنیادنانەوەی متمانە

(یاقوب) گوتی: "دوای خوێندنەوەی (پیاوان لە مەریخەوە هاتون) بیرم کردەوە کە دەتوانم بگەڕێمەوە بۆلای هاوسەرەکەم و شتەکان چارەسەر بکەم. ئێمە هەردوکمان بڕیارمان دابو کۆتایی بە هاوسەرگیرییەکەمان بهێنین. من گەیشتبومە ئەو بڕوایەی کە لە رێگەی جێبەجێکردنی ئەم بیرۆکە نوێیانەوە دەتوانین هاوسەرگیرییەکەمان سەربخەین. بەڵام (تێرێسا) بڕوای نەدەکرد.

دوای وتووێژی زۆر دوبارە چوینەوە لای یەکتر، بەڵام هێشتا ئەو گومانی هەبو. من ئەو هەمو ساڵە هەڵەی زۆرم کردبون و ئەو بڕوای نەدەکرد کە دەتوانم بگۆڕێم. نزیکەی شەش مانگی پێچو تا وردە وردە گۆڕاو و ئیتر متمانەی پێکردم. هەرچەندە من حەزم نەدەکرد ئەوەندە زۆر چاوەڕێ بکەم، بەڵام بنیادنانەوەی متمانەکە یارمەتی دام ئەو شتانە پتەو بکەم کە پێویستم بو لە بارەی پەیوەندییەکانەوە فێریان ببم.

**بنیادنانەوەی متمانەکە یارمەتی دام ئەو شتانە پتەو بکەم**
**کە پێویستم بو لە بارەی پەیوەندییەکانەوە فێریان ببم.**

کێشەکەم ئەوەبو من شتەکانم بەپێی مەرجەکانی خۆم دەخواست. وامدەزانی

مەرجەکانی ئەو ئەقڵانی نین. کە ئەو لە شتێك نارەحەت دەبو یاخود وەکو پێویست دۆستانەو ئەرێنی نەبو، دەچومە ئەشکەوتەکەمەوە و دەموچاوم دەدا بەیەکدا. بۆ چەند رۆژێك خۆشەویستیم رادەگرت. پاشان، کە لە ئەشکەوتەکەم دەهاتمە دەرەوە، بە جۆرێك مامەڵەم دەکرد وەك ئەوەی هیچ رووی نەدابێت. جار لەدوای جار ئەوم لە دۆخێکدا بەجێدەهێشت هەست بە ناتەواوی بکات. ئێستاش سارد دەبمەوە و پاشەکشە دەکەم بۆ ناو ئەشکەوتەکەم، بەڵام تاکە جیاوازی ئەوەیە کە کاتێ دێمەوە دەرەوە ئامادەییم زیاترە، هاوسۆزترم، دووبارە ئاخاوتنەکە دادەمەزرێنمەوە و کات تەرخان دەکەم بۆ تێگەیشتن و پشتڕاستکردنەوەی گۆشەنیگاکانی ئەو.

بەم تێگەیشتنە نوێیەوە کە بۆچی ئەو گومانی لێم هەبو، توانیم لە رێگەی کردارەکانمەوە نیشانی بدەم کە ئەوم بەلاوە گرنگە و بایەخی پێدەدەم. ئەو توانی وردە وردە دوبارە خۆشی بوێم. ئێمە ئەمڕۆ زۆر دڵخۆشین و هەستێکی زۆر خۆشە کە دەزانم من دەتوانم ئەم دڵخۆشییە بهێڵمەوە.



## با هەر هاوڕێ بین

(وڵ) رونی کردەوە: (سارا)ی هاوڕێ کچەکەم، بڕیاری دا کە دەیەوێت تەنیا هاوڕێ بین و دەیەوێت لەگەڵ پیاوێکی دیکەدا ژوان ببەستێت. نەمدەزانی چی بکەم. دەبو تەنیا بە روخۆشییەوە قبوڵی بکەم، بڕۆم یان چی؟ ئایا دەبو بۆ بەدەستهێنانی خۆشەویستییەکەی توڕەببم و شەڕ بکەم؟ زۆر سەرم لێ تێك چوبو. لام وابو هەمو ئەرکەکانی خۆمم بە باشی ئەنجام داوە.

دوای خوێندنەوەی کتێبی (مەریخ و ڤینۆس پێکەوە تا سەر) بۆم دەرکەوت من زیاد لە پێویست هۆگری بوبوم. فۆکەسی پەیوەندییەکە هەمیشە لەسەر من بو. دەچوم بۆلای و باسی هەمو شتێکی خۆمم بۆ دەکرد. هەمیشە من پەیوەندییم پێوە دەکرد. وام دەزانی ژنان ئەمەیان دەوێت و منیش خۆم ئەوەم دەویست.

**وابزانم من زۆر بە سەختی فێری ئەوەبوم کە**
**(پیاوی هەستیار) خەڵك دەهێنێتەوە سەر سفر.**

وابزانم من زۆر بە سەختی فێری ئەوەبوم کە (پیاوی هەستیار) خەڵك دەهێنێتەوە سەر سفر. لەبری ئەوەی بچم بۆلای و هەستی ئازار و فەرامۆشکردنەکەی خۆمی بۆ باس بکەم، بڕیارم دا هەستەکانم بنوسمەوە. وەك پێشنیارت کردبو، هەر کاتێك خەریك دەبو بیری بکەم دەستم دەکرد بە نوسینی نامەیەك کە توڕەیی و ناڕەحەتی و ئازار و ترس و تاوانی لەخۆ دەگرت. دوای نوسینی هەستە نەرێنییەکانم، فۆکەسم دەکردە سەر دەربڕینی تێگەیشتن، لێبوردەیی و خۆشەویستی. ئەمە نەك تەنیا یارمەتی دەدام ئاسودە ببم، بەڵکو دواجار بۆم دەرکەوت کە من کەسێکی چەند خۆپەرست و تەماعکار بوم. لە پەیوەندییەکەماندا هیچ حسابێکم بۆ هەستەکانی ئەو نەکردبو.

پاش چەند هەفتەیەك چاوەڕوانی، تەلەفۆنێکی سەرپێیم بۆ کرد بۆ ئەوەی بزانم خەریکی چیە. زۆر دوودڵ بو قسە بکات. ئارامم کردەوە بەوەی کە پێویست ناکات سەبارەت بە ڕەتکردنەوەی من هەست بە تاوانباری بکات. لەبری ئەوەی فۆکەس بکەمە سەر باسکردنی هەستەکانی خۆم، بە گەشبینی مامەوە و ئاخاوتنەکەم ئاڕاستە دەکرد. پرسیارم لێ دەکرد و لەبری ئەوەی کاردانەوە بنوێنم تەنیا گوێم دەگرت. دوای چەند هەفتەیەکی دیکە و چەند تەلەفۆنێکی دیکە بانگهێشتم کرد بۆ نانخواردن. ئەویش قبوڵی کردو ئێستا پاش تێپەڕبونی نزیکەی ساڵێك دەزگیرانی یەکترین. سەختە بڕوا بکەیت گۆڕانکارییەك دەتوانێت ئەم جیاوازییە گەورەیە دروست بکات.



## دروستکردنی پابەندی

(کێیت) ئەمەی باس کرد: من و (جانێت) نزیکەی ساڵێك پەیوەندییمان هەبو، پاشان گەیشتینە خاڵێکی هەستیار: ئایا پابەند دەبین بە پەیوەندییەکەمانەوە یان نا؟ ئایا هاوسەرگیری دەکەین؟

(جانێت): لەراستیدا من نەمدەویست هاوسەرگیری بکەم. بەڵام بە دڵنیاییەوە پابەندییەکم دەویست لەگەڵ (کێیت)دا. بەڵام (کێیت) نەیدەویست پەیمان بدات واز لە بینینی ژنی دیکە بهێنێت، لەوکاتەدا نەیدەویست.

(کێیت): من سەرنجڕاکێش بوم. نەمانتوانی کێشەکە چارەسەربکەین. لەوکاتەدا،

(جـۆن گـرەی)م لـەپێش (جانێـت)ەوە دەناسـی، و ئێمـەش بـە تەلـەفۆن راوێـژمان لێ وەردەگرت. ئەو بارودۆخەکەی ئێمەی دەخستە ڕو، پشتڕاستی دەکردەوە بەبێ ئەوەی لایەنی هیچ یەکێکمان بگرێت، ئەمەش زۆر سەرنجڕاکێش بو.

گوتی "(کێیت)، تۆ دەتەوێت ئەزمونی دیکەت هەبێت، ژوان لەگەڵ ژنی دیکەدا ببەستیت، لە مەیدانەکەدا یاری بکەیت." گوتم "بەڵێ." گوتی "(جانێت) تۆش دەتەوێت (کێیت) تەنیا لەگەڵ تۆدا بێت. داخوازییەکانت سەبارەت بە پابەندییەکی رون و ئاشکرا لەگەڵ (کێیت)دا بەدی نەهاتون. "زۆر سەرنجڕاکێش بو کە گوێم لە (جۆن گرەی) بو هێزی بە (جانێت) بەخشی بەوەی گوتی دەزانی چی، تۆ شایستەی ئەمەیت، تۆ شایستەی ئەمەیت کە پابەندییەکی روون و ئاشکرا لە (کێیت) داوا بکەیت.

(جانێت): راستە. (جۆن) بە منی گوت: گوێت لێ بو (کێیت) گوتی چی؟ گوتی ئامادە نی‌یە پەیوەندییەکەی تەنیا لەگەڵ تۆدا سنوردار بکات. ئەوە ئاسایی‌یە بۆ تۆ؟ ئایا تۆ دەتوانیت ئەمە قبوڵ بکەیت و پەیوەندییتان هەر هەبێت؟" دەبو بڵێم نەخێر، نەمدەتوانی.

(کێیت): ئینجا (جۆن) گوتی: ئێوە قسەی خۆتان کرد. وا دەردەکەوێت کە ئێوە دەبێت لەیەکتر جیاببنەوە. دەبێت بڕیار بدەن.

هەردوکمان ئەمەمان دەزانی، بەڵام (جۆن) تەنیا بە هێزێکی زیاترەوە باسی بارودۆخەکەی کرد، زۆر رونتر لەوەی کە ئێمە بینیبومان، بۆ ئەوەی بەتایبەتی (جانێت) ئەو شتە ببیستێت کە نەیدەویست بە ئاگایانە ددانی پیا بنێت.

(جانێت): بەڵێ، ئەو بارودۆخەکەی رونترکردۆتەوە و باسی لێوە کرد بۆ ئەوەی بتوانین هەقیقەتی پەیوەندییەکەمان بزانین. ئەمە وانەیەکی سەخت بو، وانەیەك بو لەبارەی راستگۆیی‌یەوە، کە هەمومان دەزانین بەشێکی گەورەی شتەکانە. بەڵام کاتێك کە بڕیار دەدەیت راستگۆبیت، لەراستیدا راستگۆیی ئەوەندە ئاسان نی‌یە.

(کێیت): بەڵام (جۆن) راستی دەکرد؛ ئێمە نەماندەتوانی پێك بهێنین. بۆیە جیابوینەوە.

(جانێت): من ناڕەحەت بوم کە ئیتر جیا دەبینەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتا تێپەڕبون بەو جیابونەوەیەدا توانای پێ‌دەبەخشیم، چونکە دەیگوت، باشە تۆ بەم شێوەیەی ئێستا پێویستییەکانت تێر نابن، بۆیە پێویستە گۆڕانکارییەك بکەیت. وابزانم لە زۆرێك لە

پەیوەندییەکانــدا خــەڵك لەگــەڵ رووداوەکانــدا دەڕوات. بــەڵام (جــۆن) ئــەو بیرۆکەیــەی پێشکەش کـردم کـە منـیش پێویسـتیی خـۆمم هەیـە و مـافی خۆمـە ئـەو پێویسـتییانەم هـەبێت. بۆیــە زۆر ســەخت بــو روبــەڕوی بیرۆکــەی جیابونــەوە ببمــەوە، چــونکە ئێمــە یەکتریمان بەراستی خۆش دەویست، بەڵام ئامادە نەبوین بچینە قۆناغی داهاتووەوە.

**ئێمە یەکتریمان بەراستی خۆش دەویست، بەڵام**
**ئامادە نەبوین بچینە قۆناغی داهاتووەوە.**

(کێیـت): ئاشـکرایە، توانـا بەخشـین بـە (جانێـت) شـتێکی سـەرەکی بـو، بـەڵام (جـۆن) یارمـەتی منیشـی دا بـەوەی بـە هەڵـەی دانـەنام کـە دەمویسـت لـە مەیدانەکـەدا یـاری بکـەم. ئەمە خۆشە، دەزانیت. ئەنجامەکە ئەوەبو ئیتر مـن بـە کەسـێکی خـراپ لەقەڵـەم نـادرێم کـە ئەو جۆرە هەستانەم هەیە. بەم جۆرە من و (جانێت) هەریەکـەمان رێگـەی خـۆی گرتەبـەر، کەچی هەرچەندە شتەکان "لە مەیدانەکەدا" زۆر باش نـەبون بـۆ مـن، بـەڵام تـوانیم ئـەوەی دەمەوێت بە ناویدا بگەڕێم بەبێ ئەوەی لەسەر شتانە بەهەڵەشەیی حوکمم لەسەر بدرێت.

(مارسیی): ئەو جیابونەوەیە زۆر سـەخت بـو. ئێمـە لـە مـاوەی ئـەو شـەش مانگـەدا چەند جارێك یەکترییمان بینی و من هەر دەگریام. لەبیرمە شەوێکیان .. چۆن بیڵێم .. هەلێکی هۆگری هەبو. ئەمە زۆر ناڕەحەتکـەر بـو، بـەڵام بەراسـتی دەمزانـی کـە دەبێـت رەتـی بکەمــەوە. بــە خــۆمم گــوت کــە مــن پێویســتە خــۆم رابگــرم و پابەنــد بم بــە بڕیارەکەوە، من شایستەی ئەوەم، بۆیە نابێت ئەوە بکەم، ئێ ..

(کێیت): ئۆه، بەڵێ، ئەو شەوەم لـەبیرە، کاتـەکانی دیکـەش. رێزێکـی زۆرم هەیـە بـۆ (جانێت) کـە داکـۆکی لـە بڕیارەکـانی خـۆی دەکـرد. ئـەوە وای لێکـردم لـە جـاران زیـاتر رێزی بگرم — و وایکرد لە جاران زیاتر سەرنجڕاکێشتر بێت بەلامەوە.

(جانێت): بەم جۆرە، شەش مانگ دواتر، چوینەوە لای یەکتر و خۆشییەکی زۆریشی لەگەڵدا بو. دواجار کە ئەوە رویدا، پەیوەندییەکەمان زۆر نایاب بو. ئـیتر توانیمـان پشـو بدەین. توانیمان دەست بکەین بە پەیوەندییەکی پابەندانە.

دواجار کە گەڕاینەوە لای یەکتری، پەیوەندییەکەمان زۆر نایاب بو.

(کێیت): ئیتر مەسەلەی راستگۆیی هەرگیز کێشەیەك نەبو. پێشتریش هەرگیز نەبوبو بە کێشە — دوو کەسی راستگۆ هەبون بزانن دەبێت چی بکەن. راستگۆییش زامنی ئەوە ناکات کە ئیتر کێشەت بۆ دروست نابێت. ئیتر لەوکاتەوە کە گەڕاوینەتەوە لای یەکتر پێم وابێت ئێمە ئاستێکی زۆر بەرزی راستگۆییمان هەبووە.

(جانێت): یەکێك لەو شتانەی لەو سەردەمە سەرەتاییەدا یارمەتی داین تەکنیکی نامەی خۆشەویستی بو. ئێمە زۆر ئەم تەکنیکەمان بەکارهێناو بەهۆی ئەوەوە توانیمان کراوە بین. کاتێك چوینەوە لای یەکتر، بەردەوام بوین لەسەر نوسینی ئەو نامانەو پێشکەشی یەکتریمان دەکرد. نوسین و خوێندنەوەی ئەم نامانە پانتاییەکی بۆ دابین کردین راستگۆ بین. پابەندبوون بە راستگۆییەوە شتێکەو راستگۆبون خۆی شتێکی دیکەیە. هەمو کەسێك دەزانێت کە چەند سەختە بڵێیت "دەزانیت، من زۆر بێزار دەبم کاتێك تۆ .." بەڵام زۆر ئاسانترە ئەگەر ئەم هەستانە بە شێوەیەکی خۆشەویستانە لەڕێگەی نامەیەکدا دەگەیەنیت.

(کێیت): ئێستاشی لەگەڵدا بێت بۆ ئێمە هەرگیز نوسینی نامەی خۆشەویستی بژاردەیەکی ئاسان نەبووە. شەڕمان دەکرد و دەهاتین و دەچوین و تەنانەت لەناو نامەکەشدا خۆش نەبو باسی هەستەکانمان بکەین. ئاسودەییەکە لەوەدایە کە دەگەیتە لایەنەکەی دیکە. زۆرجار، لە کۆتایی نامەکەدا هەمو شتەکانمان چارەسەر نەکردبو. بەڵام زۆریی نامەکە ئازادییەکەی دروست دەکرد. لە سیمینارەکانی (جۆن)دا من هەمو جۆرە کەپڵەکانم بینیوە کە لەکاتی دەست بەتاڵیاندا نامەی خۆشەویستی دەنوسن و بیرۆکەکەیان زۆر لا پەسەندە، واتە دەخوێننەوە. بەڵام ئێمە وا نەبوین: تەنانەت خوێندنەوەی نامەکانیش بۆ یەکتری ئاسودەیی پێنەدەبەخشین. بەڵام هەر دەمانکرد.

ئەم نامانە سەرکەوتوون. بەهێزن و هەمو شتەکان بەبێ ترس دێنە دەرەوە. لە هەمان کاتدا، فێر دەبیت. ئەگەر من شتێك ببینم لە هاوسەرەکەمدا کە بە جۆرێك ناشیرین بێت، پێویست ناکات لەناوی ببەم. لەراستیدا ناتوانم لەناوی ببەم. بەم جۆرە نامەکان فێرت دەکەن چۆن مامەڵە لەگەڵ هەستەکاندا بکەیت.

**ئەگەر من شتێک ببینم لە هاوسەرەکەمدا کە بە جۆرێک ناشیرین بێت، پێویست ناکات لەناوی ببەم.**

هەمو جارێك دایك و باوكم شەڕیان دەكرد، ماوەی هەفتەیەك قسەیان نەدەكرد؛ كاتێكیش كە ئەو بابەتە نەدەما، بە هیچ جۆرێك باسی لێوە نەدەكرا. بەڵام بەهۆی ئەم نامانەوە لەراستیدا دەتوانیت بەشێوەیەكی كاراو ئەرێنی كار لەسەر ئەم هەستە سەختانە بكەیت و فێر ببیت چۆن لەم كارەدا سەركەوتوتر بیت.

(جانێت): دواجار بوینە دەستگیران و هاوسەرگیرییمان كرد و منالێكمان بو. دەتوانم بڵێم پێش ئەو منالە بەراستی كارمان لەسەر پەیوەندیكردن دەكرد، هەرچەندە من دوودڵ بوم. هەر كاتێك مەسەلەیەك رویدەدا و پێویست بو كاری لەسەر بكەین، بۆ رێگەیەك دەگەڕام رزگار ببم، وام بیردەكردەوە من مامەڵە لەگەڵ ئەم كێشەیەدا ناكەم و لێی دەردەچم.

(كێیت): بەڵام ئێمە ئامرازەكانی (جۆن گرەی)مان هەبو كە هەرچەندە هێواشن بەڵام بەهێزن. كە شەڕێك روودەدات دواجار دەتوانین بڵێین "دەزانین چۆن لەمە دەرباز ببین." رەنگە نەتوانین رێك لەو شوێنەدا چارەسەری بكەین بەڵام دەزانین كە دەتوانین چارەسەری بكەین.

(جانێت): باشترین شت بۆ من ئەوەبو فێرببم چۆن باسی هەستەكانم بكەم. (كێیت) ئەوكاتانە باشتر دەتوانێت گوێم لێ بگرێت كە تەنیا باس لە هەستەكانم دەكەم و پەنجەی ئاماژە بۆ ئەو راناكێشم.

(كێیت): راستە. دەزانێت چۆن ئەو شتە بڵێت كە دەیەوێت و شەرم ناكات لە داواكردنی و هەمیشە بەجۆرێك ئەمە دەكات كە رێزێكی زۆر بۆ من دەردەبرێت. بۆیە بەم شێوازی پەیوەندیكردنە كە بۆ چارەسەركردنی ناكۆكییەكان، پەرەمان پێداوە هەردوكمان ئەو شتانە بەدەست دەهێنین كە دەمانەوێت.

(جانێت): كاتێك كە منالەكەمان بو، بەلامەوە سەخت بو بە ئامادەبونی منالەكە بە كراوەیی و راستگۆییەوە پەیوەندی بكەم. نەمدەویست گوێی لە دەنگێكی بەرز ببێت.

دەمویست بـەڕێز بم لەگەڵیدا. یـەك دوجـار تەقیومەتـەوە یـاخود کاردانـەوەم کـردووە کاتێك (جێنیفەر)ی لێ بووەوەو ئەویش دەستی کردووە بە گریان.

**کاتێک کە منداڵەکەمان بو، بەڵامەوە سەخت بو بە ئامادەبونی منداڵەکە بە کراوەیی و راستگۆییەوە پەیوەندی بکەم.**

(کێیت): دەزانیت، زۆربەی جار کاتێکی خۆشمان لەگەڵ منداڵەکەماندا بەسـەربردووە. کاتێك لە کاردانەوەیدا بەرامبەر بە ئێمە دەست دەکات بە گریـان، باشـە، ئـەو وەکو ئـەم گەرمی پێوە بچکۆلە بێتاوانە وایە کە پێمان دەڵێت ئێمـە چـی لـە ژینگەکەی دەکـەین. کەواتە ئێستا شارەزاییەکی باشی پەیوەندیکردن سودێکی باڵاتری هەیە. من هەسـتێکی بـەهێزم هەیـە کـە ئـەم سـاڵانی سەرەتایە قـوڵترین کاریگـەری لەسـەر پەیوەندییـەکان بـەجێدەهێڵن. زۆر گرنگـە بـۆ ئێمـە کـە بـە راسـتگۆیی ئـەو ژینگەیـە بـۆ (جێنیفـەر) دروست بکەین کە دەمانەوێت هەبێت.

**کاتێک لە کاردانەوەیدا بەرامبەر بە ئێمە دەست دەکات بە گریان، باشە، ئەو وەکو ئەم گەرمی پێوە بچکۆلە بێتاوانە وایە کە پێمان دەڵێت ئێمە چی لە ژینگەکەی دەکەین.**

(جانێـت): بـەڵام تـەنیا (جێنیفـەر) کـاری تێنـەکراوە. لەوەتـەی ئـەومان هەیـە زۆر شتیش بەسـەر خۆمانـدا هـاتووە کـە کاریـان لەسـەر بکـەین. پێویسـتییەکانی ئـەو زیـاتر کەوتونەتە ئەستۆی من: من خزمەتی دەکەم، من لە ماڵەوەم، هـەروەها دەبێـت هەمیشـە لەیادم بێت کە داوای یارمەتی لـە (کێیـت) بکـەم. (کێیـت) ئـەو شـتانە نابینێـت کـە مـن دەیـانبینم و ئـازاردەرە بـۆ مـن داوای لێ بکـەم، بـۆ نمونـە، کـە ئـامێری بەهەڵمکردنەکـە پڕبکاتەوە یان کارێکی بچوکی لەوجۆرە بکات. بەڵام ئەگەر خۆم داوای لێ بکەم ئـەنجامی بـدات و هەسـت بـە پشتگیری بکـەم کـە ئـەنجامی دەدات، ئـەوا وەکو شـتێك لـەلای خـۆم دەیهێڵمەوە و پەست دەبم.

(کێیت): "شتە بچوکەکان". ئەمە چەمکێکی مەترسیدارە چونکە رەنگە تەنیا لە جیهانی پیاواندا ئەم شتانە بچوك بن. (جۆن) باسی ئەنجامدانی شتی بچوك دەکات بۆ یەکتری — گوڵ، کارت و شتی لەوجۆرە — و من بۆم دەرکەوتووە ئەم شتانە نەك هەر ژیانی (جانێت) بەڵکو ژیانی هەردوکمان دەوڵەمەندتر دەکەن. مایەی پێکەنینە، ئێمە دواجار توانیمان چاودێرێك بۆ ماڵەکەمان پەیدابکەین و بڕۆینە دەرەوە، لەپڕ لە شوێنی وەستانی ئوتومبیلەکە بیرم کەوتەوە کە جاران دەرگام بۆ (جانێت) دەکردەوە. بۆیە دەرگاکەم بۆ کردەوە و هەستم کرد، ئۆه، بەڵێ، من پێشتر ئەمەم دەکرد — ئەمە زۆر نایابە.

(جانێت): بە دڵنیاییەوە من تێبینیم کرد. تۆزێ بێماناو پوچ دەرکەوت، بەڵام خۆش بو، تۆزێکیش کۆن بو، گەڕاینەوە بۆ رۆژانی سەرەتای خۆشەویستییەکەمان. (کێیت) نیشانی دەدام کە دەیەوێت خزمەتم بکات، بڕێك کریم بخاتە سەر کێکەکە. منیش بە دڵنیاییەوە حەزم لە کریمە.

(کێیت): دەبینیت، شتەکان ئەوەندە بچوکن کە رەنگە بێ مانا دەربکەون، بەڵام من وا دەزانم کە ئەم شتانەن دەتوانن پەیوەندی بە زیندویی بهێڵنەوە.

(جانێت): بە شێوەیەك لە شێوەکان، شتێکی وەکو کردنەوەی دەرگای ئوتومبیلەکە بۆ من وەکو گەمەیەکی شکۆدار وایە. رۆمانسیيە. ئێمە بەهۆی کارو مناڵەکەمانەوە زۆر سەرقاڵین بەڵام هەوڵ دەدەین خزمەتی یەکتریش بکەین. ئێمە کۆکین لەسەر ئەوەی کە گرنگە کات تەرخان بکەین بۆ سێکس و رۆمانس. ئێمە پێویستمان بەوەیە لە پەیوەندیەکەماندا تەندروست و دڵخۆش بین بۆ ئەوەی ببین بە هاوبەشێکی باش.

**ئێمە پێویستمان بەوەیە لە پەیوەندیەکەماندا تەندروست و**
**دڵخۆش بین بۆ ئەوەی ببین بە هاوبەشێکی باش.**

(کێیت): زۆر راستە. لە کاتە سەختەکاندا، مەسەلەکە هەر پەیوەندیکردن نییە. بەراستی بۆ من رونە کە ئەوەی رودەدات ئەوەیە ئێمە زۆرمان تێپەڕاندووە بەبێ ئەوەی لەسەر ئاستی هۆگری پەیوەندییمان هەبێت.

ئەمەش شتێکی دیکەیە لەبارەی سێکسەوە: بۆ من وەکو نێرینەیەك، گرنگی ئەوەی

کە کات تەرخان بکەیت و سەبرت هەبێت بۆ سێکس وانەیەکی بەردەوام بووە بۆ من. تەرخان کردنی کات هاوتایە لەگەڵ دروستکردنی هۆگریی و ئەزمونێکی نایاب.

(جانێت): بەلای منەوە گەورەترین گەشەکردنی ژیانی سێکسیمان ئەوەبووە کە راستگۆتر بووین. شتەکەی (کێیت) کاتە — لەسەرخۆیی — بەڵام بەلای منەوە راستگۆیی‌یە: ئەوەی کە پێ بڵێیت چیت بەلاوە راستەو چیت بەلاوە ناراستە، بەشێوەیەکی ناسك و رویەکی خۆشەوە. ئاسانە کە لە سێکسدا لەڕوی پەیوەندییکردنەوە بکوژێتەوە، بەڵام ئەگەر ئێمە بەراستی وریاو بەئاگابین لە لاوازییەکانی یەکتری، ئەوا بەراستی دەکرێینەوە. سێکس ئەو لە کێشەیەیە کە بەیەکتریمانەوە دەبەستێتەوە.

(کێیت): دەزانیت، من هاوڕێیەکم هەیە کە هەفتانە تەلەفۆنم بۆ دەکات بۆ وەرگرتنی ئامۆژگاری لەبارەی پەیوەندییەکانییەوە ئەمەش مانای وایە من لێی دەزانم. زۆربەی کارەکانی دروستکردنی پەیوەندی هەمو کەس دەیزانن. ئەوەی بەلای منەوە راستییە ئەوەیە لەگەڵ هاوسەرەکەمدا شتەکان چارەسەر بکەین و زیاتر لەو تێبگەم. بەمە بەراستی خۆشەویستی دەبێتە شتێکی زۆر ئاسایی و بێ فیز، بە پرۆسەیەك لە چارەسەرکردنی شتەکان بە کردەوە. کاتێك مشتومڕێکمان توش دەبێت، شێوازە کۆنەکە سەرهەڵدەداتەوە، ئینجا دەست دەکەین بە هەوڵدان، بەردەوام کاردەکەین بۆ گێڕانەوەی شتەکان بۆ بارە هاوئاهەنگەکە. ئەو هەستەم بۆ دروست دەبێت کە بەڵێ، ئێمە بۆ ماوەیەکی دورودرێژ ئەم کارە ئەنجام دەدەین. هیچ گومانی تێدا نییە.

(جانێت): راستە، ناتوانم ئەوە بهێنمە بەرچاوی خۆم کە هاوسەرگیرییمان نەکردبێت. هەرچەندە ئێمەش بەشی خۆمان شەڕ و دەمەقاڵێمان هەیە، بەڵام ژێرخانێکی بەهێزمان هەیە و پابەندین بە هاوسەرگیرییەکەمانەوە. ئێمە بەوەدا تێدەپەڕین کە بۆ ئەوەی سەرکەوتو بین پێویستە پیایدا تێپەڕین. وابزانم شتە گەورەکە ئەوەیە کە ئێمە ئامرازەکانمان هەیە. ئەم ئامرازانە لەبەر سێبەرەکەی حەوشەدا دانانێین. بەڵکو بەکاریان دەهێنین.

## دیاریکردنی ستانداردەکان

(شێری) دەیویست ئەم کارە بە چاکی ئەنجام بدات. "ئێمە لە ئاهەنگی بیست ساڵەی دەرچون لـە ئامادەیی یـەکترمان بینییـەوە. (کـێن) ساڵی ١٩٧٣ ئامادەیی تـەواو کردبـو و یەکسەر خۆی لە هێزی دەریـایی نـاونوس کردبـو. مـن لـە یەکـەم ساڵی زانکـۆم دووگیـان بوبوم و وازم لە خوێندن هێنابو. پاشان دوای دە ساڵ زانکـۆم تـەواو کردبـو و بڕوانامـەم لە بواری تەندروستی ددانـدا بەدەست هێنابو.

تـا ئەوکاتـەی لـەو ئاهـەنگی یەکگرتنەوەیـەدا یـەکترمان بینی‌یـەوە، هەریەکـەمان دووجار هاوسەرگیرییمان کردبو. (کێن) مناڵێـك و هـەرزەکارێکی هـەبو، منـیش خـاوەنی دوو مناڵ بـوم؛ یـەکێکیان گـەورەبوبو، ئـەوی دیکەشـیان حـەوت سـاڵان بـو. مـن ئەوکاتـە نزیکەی هەشت ساڵ بـو ڕەبـەن بـوم و هـیچ پەیوەندییـەکی جـددیم نـەبو، تـەنیا لێـرەو لەوێ یەك دوو ژوانم بەستبو. هەردوو هاوسەرگیرییەکەم کەمتر لە ساڵێکیان خایانـدبو. لە یەکەم دانەیاندا، کە تەمەنم چواردەساڵان بو، پێویست بـە وتـن ناکـات، کـە تەمـەنمان زۆر منـاڵ بـو. هاوسـەرگیریی دووەمیشـم کـە تەمـەنی بیسـتو نـۆ سـاڵان بـو، هـەر لـە سەرەتاوە پەیوەندییەکی بەئازار بو.

هاوسەرگیری یەکەمی (کێن) بەهۆی ناپـاکیی هاوسـەرەکەیەوە کۆتـایی هـاتبو؛ ئـەوی دیکەشـیان دوای چـەند مـانگێکی کـەم لـە هاوسـەرگیرییەکەیانەوە خۆیـان بڕیاریانـدابو کۆتایی پێبهێنن چونکە لایان وابو وەکو هاوڕێ بمێننەوە باشترە.

لە کاتی ئاهەنگەکەدا، من دەستبەجێ (کێن)م ناسی‌یـەوە، هەرچـەندە ئێمـە هـەرگیز هاوڕێی یەکتر نەبوبوین، تەنیا لە خوێندنگە یەکترییمان ناسی بو. لە خوێندنگە زیـاتر وەکـو کـوڕە دراوسـێ وابـو، ئـەوەش لـەو تەمـەنی چـواردە سـاڵییەدا شـتێکی زۆر سەرنجڕاکێش نەبو. بەڵام کاتێك لە ئاهەنگەکە تەماشای کردم و بەو دەنگە لەسـەرخۆ و دڵنیاکەرەوەیە قسەی لەگەڵ کردم، دڵـم خـۆش بـو. ئێمـە لانـی کـەم یـەك کاتـژمێرونیو قسەمان کردو باسی مناڵی و مناڵ و هاوسەرگیری و بیست ساڵی ڕابـردوی تەمـەنمان بـۆ یەکتری گێڕایەوە. لەبیرمە کە وام هەست دەکرد ئەم کەسە پیاوێکی باشە.

بۆ ڕۆژی دواتر، بیرم کردەوە کە هیچم نی‌یە لەدەستی بدەم، بۆیە تەلـەفۆنم بـۆکرد. بەڵێ، ئەو شەوە لای ئێمە مایەوە. چەندین کاتژمێر قسەمان کـرد، لەگـەڵ کـوڕە حـەوت ساڵەکەماندا تەماشای فیلمـمان کـردو مناڵەکەیشـم لـە چـرکەیەدا کـە (کـێن) نوشـتایەوە

ماچم بکات، وتی (ئیتر بەسە خانم!) ئەوەندە سەرمان سوڕما کە هەمومان کەوتینە پێکەنین. دواتر بە (کێن)م وت هەمو ئەمانە دواجار دەکەوێتەوە سەر یەك وشە. کاتێك بە گاڵتەوە لێم پرسی (ئایا سبەینێ بەیانیش هێشتا ڕێزم لێدەگریت؟) وتی (بە دڵنیاییەوە!) ئێستا ئەو وشەیە پەسەندترین وشەیە لەلام!

ڕۆژی دواتر ڕۆیشت، وەك پێشتر بەرنامەی بۆ دانرابو، بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ خوێندنگە لە (ئۆریگۆن) بۆ ئەوەی ببێت بە وردبینی بیناسازی. منیش بێ سەبرانە بە کارت و تەلەفون بەشوێنییەوە بوم. مانگێك دواتر چوم سەردانی بکەم و لەوسەرەوە لەگەڵمدا هاتەوە و چەند هەفتەیەك پێکەوەبوین. چوین بۆ گەشت و کوڕەکەم کە لەگەڵماندا بو، هەرچەندە تۆزێك غیرەی دەکرد بەڵام بەراستی ئەویش (کێن)ی خۆش دەویست. دوای گەشتەکە، (کێن) گەڕایەوە بۆ (ئۆریگۆن) بەڵام لە جەژنی سوپاسگوزارییدا هاتەوە و هەرگیز نەڕۆیشتەوە.

ماوەی زیاتر لە ساڵێك پێکەوە ژیاین. ئێمە زۆر دەگونجاین لەگەڵ یەکتر، لە روی سێکسی و لە روی دیکەشەوە، ئەویش لەگەڵ کوڕەکەشم و بۆ کوڕەکەشم باش بو. لە ماوەی شەش مانگی یەکەمدا، هەرچەندە تێمانپەڕاند، بە جۆرێك هەستم دەکرد بەکاردەهێنرێم، چونکە (کێن) بەشدارییەکی زۆری نەدەکرد لە روی داراییەوە. من چەندین جار توشی خەمۆکی بوم و دواجار دوای شەش مانگ کارتەکانم خستە سەرمێزەکە. وتم هەست دەکەم بەکاردەهێنرێم چونکە ئەو ئامادە نییە پارە بدات بۆ ژیانە هاوبەشەکەمان. ئەوە راستە کە ئەویش بە قەیرانێکدا تێپەڕ دەبو چونکە ئەوەندە نەبو دوای بیست ساڵ خزمەتکردن لە هێزی دەریاییدا خانەنشینکرا بو و بەمەش هەستی بە جۆرە ونبونێك دەکرد. ئەو کاری نەدەکرد بەڵام موچەی خانەنشینی وەردەگرت. بەڵام، من کارێکم هەبو کە موچەیەکی زۆرم وەردەگرت، بۆیە ئەمە لە بنەڕەتدا زۆر پەیوەندی بە پارەکەوە نەبو. دواتر، ئەو بەشداری کرد و شتەکان کەمێك باشتر بون. بەڵام شتێکی دیکە هەبو.

(کێن) لە سەرەتاوە پێی گوتم کە پێم ناڵێت خۆشی دەوێم تا ئەو کاتەی دڵنیا دەبێت. وتی پابەند دەبێت بە پەیوەندییەکەمانەوە بەڵام هێشتا ناتوانێت بڵێت منی

خۆش دەوێت. بۆیە خەمۆکییەکەم بەردەوام بو. ئەمە زۆر سەختە بۆ کەسێك ڕێز لەخۆی بگرێت. کاتێك هاوڕێیەکت لێت دەپرسێت (شتەکان چۆن بەڕێوە دەچن؟) تۆ ناچاربیت بڵێیت (نازانم.)

**وتی پابەند دەبێت بە پەیوەندییەکەمانەوە**

**بەڵام هێشتا ناتوانێت بڵێت منی خۆش دەوێت.**

دواجار لە مانگی ئەیلولدا وتم (ئەگەر تا ئێستا نازانیت منت خۆش دەوێت یان نا، وا باشترە بڕۆیتە دەرەوە تا بۆت دەربکەوێت.) وا دیاربو (کێن) وای دەزانی خۆشەویستی (هەستێك)ە کە دڵنیا نەبو بەرامبەر من هەیبێت.

(کێن) ماڵەکەی بەجێ هێشت و بۆ کارێك نزیکەی یەك مانگ دورکەوتەوە. کە گەڕایەوە پێم وت ناتوانین لەو شوێنەوەی بەجێمان هێشتووە دەست پێبکەینەوە، چونکە عیزەتی نەفسم ڕێگەم پێنادات و بۆ کوڕەکەشم زۆر سەختە، کە تا ئەوکاتە زۆر هۆگری (کێن) بوبو.

ئێمە تەنیا کەمێکی یەکترییمان بینیبو، کە ئەویش زۆر ڕوونو ئاشکرا نەبو.

پاشان، شەوێکیان تەماشای تەلەفزیۆنمان دەکرد و ریکلامێکی (جۆن گرەی) نیشاندا. (د. جۆن گرەی) زۆر قۆشمەو خۆشبو و هەمو ئەو شتانەی گوت کە من هەستم پێدەکرد. من بە (کێن)م وت (ئێمە پێویستمان بەمەیە) مەبەستم کاسێتەکان بو. (کێن) تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و یەکسەر داوای کاسێتەکانی کرد. بڕوام نەدەکرد! بەلای منەوە، ئەوە کردارێکی پڕ لەخۆنەویستی و ئەرێنی بو زۆر سەرسام بوم پێی.

ئێمە زۆر جدیی بوین لەبارەی کاسێتەکانەوە و هەمو شەوێك گوێمان لێ دەگرت. کاسێتەکەمان لە ناوەڕاستدا رادەگرت و دەستمان دەکرد بە قسە کردن لەسەری یاخود دەمانخستەوە ئەوەڵ و دووبارە گوێمان لێ دەگرتەوە. دواجار (کێن) تێگەیشت چ هەستێکم هەبو. (کێن) جاران و ئێستاش لە گوێگرتن و لە ئامادەیی بۆ گۆڕینی ئەو شتانەی کە پێویستیان بە گۆڕینە زۆرباشە (ئێستا بەردەوام گوڵم بۆ دەهێنێت، کە پێشتر هەرگیز شتی وای نەکردبو). لەلایەکی دیکەوە، من بۆم دەرکەوتووە کە

مەریخییەکان چۆن بیردەکەنەوە. پێش ئەوە، بە خۆمم دەوت (ئای چەند بێئەقڵە، ئایا تێناگات کە من چ ئازارێك دەکێشم؟)

ئێستا هاوسەرگیرییەکی شادمانمان هەیە و دەزانم ئەگەر کاسێتەکان نەبونایە پەیوەندییەکەمان بەم شوێنە نەدەگەیشت. هەردووکمان ئەم هەستەمان هەیە. هەرچەندە ئێمە کامڵ نین، بەڵام ئەوەی هەمانە بەهێز و پتەوە. من وادەزانم لەبەرئەوەی هەردوکمان ئەزمونی خراپمان هەبوە لە رابردودا، پێزانینمان بۆ ئەو شتانەی ئێستا هەمانە زۆر زیاترە وەك لەوەی دەمانتوانی لە پەیوەندییە کۆنەکانماندا هەمانبێت. ئێمە کێشە و شەڕی خۆمان هەیە، بەڵام ژیانێکی باشمان هەیە، و من زۆر سوپاسگوزارم کە ئەم پیاوەم هەیە.



## رێبەرێك بۆ پەیوەندییەکان

(ساندی) چیرۆکی چەند نەوەیەکی گێڕایەوە: نزیکەی دوو ساڵ دەبێت کە کتێبەکەی (پیاوان لە مەریخەوە هاتون و ژنان لە ڤینۆسەوە)ی تۆم خوێندۆتەوە، کە باشترین کتێبە خوێندبێتمەوە بۆ تێگەیشتن لە (وێس)و لە خۆم. لەوەدەچو ئەم کتێبەت تەنیا بۆ ئێمە نوسیبێت. کەسێك کتێبەکەی لە بارەگای (ئەلئانۆن)ی (تایلەر) لە (تەکساس) بەجێهێشتبو، کە ئەو رۆژە من لەوێ کارم دەکرد، و ئەو بەیانییە پەنجا لاپەڕەیم خوێندەوە! خۆشبەختانە ئەو شەوە کەس تەلەفۆنی نەکرد توانیم بەراستی بەبێ پچڕان چێژ لە کتێبەکە وەربگرم.

تەلەفۆنم بۆ کچەکەم کرد و ئەو بەشەم بۆ خوێندەوە کە باسی (تۆم)و (ماری) دەکات کە لە گەشتەکەیاندا ون بون و (ماری) داوا لە (تۆم) دەکات پرسیاری ناونیشانەکە بکات. کچەکەم کە وتی (ئۆو، دایە، کەواتە من ئەم کارەم بەهەڵە ئەنجام دەدا!) ها! پاشان تەلەفۆنم بۆ (وێس)ی هاوسەرم کرد و ئەویش وتی (ئایا کە گەڕایتەوە کتێبەکە لەگەڵ خۆت دەهێنیتەوە؟)

من لە بارەی ئەمەوە مشتومڕی لەگەڵ ناکەم، بەڵام دەزانم شتێکی بێمانایە ئەگەر پرسیاری ناونیشانەکە نەکەیت. ئێستا ئێمە دەیکەین بە گاڵتە و ئەویش کەمێك زوتر پرسیارەکە دەکات.

من پێنج دانە لەو کتێبەم کڕی و یەکی یەك دانەم دا بە منالە پێگەیشتووەکانمان و ئەمەم تیادا نوسی:

من و باوکتان نمونەیەکی زۆرباش بوین بۆ ئێوە، بە تایبەتی ئەوکاتەی کە ئێوە گەورە دەبون، چونکە ئێمە لە پەیوەندییە هاوسەرگیرییەکەماندا (باشترین دەرفەت و تواناکان) نەبو، بەڵام هیوامان وایە ئەم کتێبە یارمەتیان بدات (لە ئێستاوە تا هەتایە) سەرکەوتوبن.

ئەوکاتە دەستگیرانی کوڕەکەم دەستی کرد بە خوێندنەوەی کتێبەکە و نەیدەتوانی وازی لێ هێنێت- لەگەڵ خۆی بردییەوە ماڵەوە. (جۆن) پێکەنی و پێی گوتم دەستگیرانەکەی دواتر شتێکی پێوتوە (ئێستا ئیتر هەوڵ دەدەم پێت نەڵێم چی بکە و چی مەکە ..) ها! ئێستا هاوسەرگیرییەکی دڵخۆشیان هەیە و کەپلێکی زۆر گونجاون. خۆشحاڵم کە کتێبێکی وەکو ئەمەی تۆ تێگەیشتنێکی بچوکیان دەداتێ لەسەرئەوەی پەیوەندییەکی باش پێویستی بەچییە.

هاوسەرەکەم پێشتر ئالودەی مەی بو و ئێستا پێنج ساڵە وازی لێ هێناوە، چەند ساڵانێکی زۆرم خەسار کرد بە هەوڵدان بۆ ئەوەی (لە ئەشکەوتەکەی دەری بهێنم). تەنانەت دوای وازهێنانیشی لە مەی، بە دەگمەن دێتە دەرەوە. ئێستا بەلامەوە ئاسانترە ڕێگەی بدەم لە ئەشکەوتەکەیدا بمێنێتەوە و ئەمەش مەسەلەیەکی نایابە. پێشتر هەرگیز نەمتوانیوە بەبێ نیگەرانبون ڕێگەی بدەم ئەم کارە بکات. کتێبەکەی تۆ دووبارە ئاراستەی کردمەوە دەربارەی گۆڕینی ئەو شتەی کە دەتوانم بیگۆڕم سەرلەنوێ ئاراستەی کردمەوە — ئەو شتەش تەنیا خۆمم.

"هەر، بەلامەوە سەخت بو واز لە چاوەڕوانییەکانم بهێنم. من هەمیشە وامدەزانی کاتێك کە هوشیارە ئیتر دادەنیشین و پێکەوە قسە دەکەین. ئەمە هەڵەیە!

کە منالْ بوم، ماوەی دە ساڵ لە ماڵی بەخێوکەرێك بوم. دواتر کاتێ خێزانەکەم یەکیگرتەوە، دایك و باوکم هەرگیز بایەخیان بەو هەستانەم نەدەدا کە لەبارەی کاتی دابڕانەکەمان هەمبو. بەلای منەوە، ئەمە فەرامۆشکردن و بەجێهێشتنی من بو، بەپاکی و سادەیی، و پاشەکشەی (وێس) بۆ ناو ئەشکەوتەکەی زۆر لەمە دەچو. دەبینیت، ئەمە وەکو دێ ژاڤو (De javu) وابو کە سەرلەنوێ ڕودەداتەوە، بەڵام کاتێك کتێبەکەی تۆم خوێندەوە کەمێك زیاتر تێگەیشتم کە چۆن پیاوان، هەمو پیاوان، پێویستیان بەوەیە

پاشەکشە بکەن بۆ ئەوەی شتەکان چارەسەر بکەن.

ئێستا وردە وردە کار لەسەر ئەوە دەکەم واز لە چاوەڕوانییەکانم بهێنم. نزاکانم هەمیشە ئەوەبون کە ئارامتر ببم و بێمەرج هاوسەرەکەمم خۆش بوێت. کێشەکانم هەمیشە ئەوە بووە کاتێك توڕە دەبم دەنگم بەرز دەبێتەوە - ئەمەش پاڵی پێوە دەنێتەوە بۆ ناو ئەشکەوتەکەی و (دەبێتە هۆی ئەوەی دووبارە هەست بە فەرامۆشکردن بکەم.) بۆیە ئەم سیناریۆیە جار لەدوای جار لە هاوسەرگیرییەکەماندا دووبارە بۆتەوە.

بەم دواییە، شتێکی جیاواز روویدا. ئێستا بەهۆی کاری هاوسەرەکەمەوە بە شێوەیەکی کاتی لە کالیفۆرنیا لە کەرەڤانەدا دەژین، و من بڕیارمدا کە وا چاکە دووبارە قسە بکەین. پێویست بو دەنگم بە نزمی بهێڵمەوە، چونکە دراوسێکانمان زۆر نزیکبون. ئەو بەجێی نەهێشتم چونکە بە پێچەوانەی ماڵەوە، گۆماوێکی لێ نییە کە ماسی تێدابگرێت. بۆیە هەردوکمان ناچاربوین بە جۆرێکی جیاواز هەڵسوکەوت بکەین. ئەو زیاد لەجاران لە هەستەکانم تێدەگەیشت و منیش زیاتر ئەوم قبوڵ دەکرد. هەروەها، لەبیرم بو کە ئاخاوتنەکە لە کورتی ببڕمەوە و ئەمەش یارمەتیدەربو.

ئەوە بەراستی ئاخاوتنێکی بەرهەمهێن بو، کە بە (تەڤینەوەیەکی چاوەڕوانکراو) یاخود (بێدەنگییەکی داخراو) کۆتایی نەهات! بە ئامێز و خۆشەویستی بۆ یەکتر کۆتایی هات. لەوکاتەوە، هەست بە ئارامی و شادمانییەکی زیاتر دەکەم و خۆشەویستیم زیاتر بووە بۆ ئەو کەسەی کە هەڵمبژاردووە پەیوەندی هەمو تەمەنمی لەگەڵدا ببەمەسەر. توڕەیی، تاڵی و پەستبونم بەجێهێشتووە و هەست دەکەم کە زیاتر هەنگاوم بەرەو پێشەوە ناوە و شتەکان زۆر بە توندی وەرناگرم.

کتێبەکەت لەبارەی تێگەیشتنەوە لە جیاوازییەکانی نێوان نێر و مێ پراکتیکترین کتێبە کە تا ئێستا بینیبێتم و زۆریش خۆشە! حەزم لە بەشی بەراوردی ئاخاوتنەکان بو - ڕێگەی راست، ڕێگەی چەوت.

هاوسەرەکەم کتێبەکەی نەخوێندۆتەوە و ئاساییە. بەڵام هەتا هەتایە سوپاسی تۆ دەکەم بەرامبەر بەوشتانەی کە تۆ و (بۆنی) لە پەیوەندییەکەتان پیایدا تێپەڕیون. ئەمە یارمەتیم دەدات بزانم کە تۆ تەنیا شتەکان نانوسیت، بەڵکو لەراستیدا لە ژیانی خۆشتدا چارەسەرتکردون.

من بە هاورێکانم لە (ئەلئانۆن) و بە خەڵکی دیکەشم گوتووە کتێبەکەی تۆ بکڕن. ئەمە باشترینە. دووبارە سوپاس.

## پێزانین!

(جانێت): "کاتێك کتێبی (پیاوان لە مەریخەوە هاتون و ژنان لە ڤینۆسەوە)م کڕی، کاتێك بەشی حەوتم خوێندەوە دەستم کرد بە گریان، کە دەڵێ (ژنان وەکو شەپۆل وان) هاوسەرەکەم بەمنی دەگوت تۆ شێتیت، پێشتر هەرگیز ژنێکی نەبینیبو کە وەکو شەپۆل وابوبێت و. کە زانیم کەسێکی ئاساییم، و کتێبەکەم دایە بیخوێنێتەوە، ئەزمونێکی مەزن بو.

ئێمە ئەمڕۆ لە هەمو کاتێك زیاتر ڕێز لە یەکتر دەگرین. سوپاسی خوا و چارەسەر؟ کتێبەکەی تۆ دەکەین کە یارمەتییان داین هەمو کێشەکانمان چارەسەر بکەین.



## ڕۆیشتن لەسەر سێ سیلیندەر

(ماری) باسی سڕبونی خۆی لە هاوسەرگیریدا و زاڵبونی بەسەر کێشەیەکی خێزانیدا کرد. کە یەکەمجار کتێبەکەی (جۆن گرەی)م کڕی، زۆرشت سەبارەت بە خۆم و پەیوەندییەکەم فێر بوم. پەیوەندی من و کتێبەکە وەکو پەیوەندی مناڵ و شیری لێ هاتبو. لەگەڵ خۆمدا کتێبەکەم بۆ هەمو شوێنێك دەبرد.

(جۆن) ڕاستەوخۆ باسی ئەو شتەی دەکرد کە منی زۆر نیگەران دەکرد. بناغەی هاوسەرگیرییەکەمان بەفرێکی زۆر داپۆشیبو من و (داوگ)ی هاوسەرم سڕبوبوین بەرامبەر بەیەکتر.

ئێستا، من کەسێکی سەرنجراکێشم. هەمیشە شتێکی خۆش و سەرنجراکێش لە ژیانمدا هەیە. تەنانەت ئەوکاتەی کە پەتاتە لێ دەنێم، دەتوانم ئەوەندە خۆشی بکەم لەلای هاوسەرەکەم کە پەلە بکات بگەڕێتەوەماڵەوە. هاوسەرەکەم هەمیشە ئەمەی زۆر بەلاوە پەسەندبووە، چونکە ئەو پیاوێکی بزنسمانە. من سەرنجی ڕادەکێشم چونکە من ژیانم زۆر خۆش دەوێت.

بەڵام شتێکمان لە دەستدابو - شتێکمان لەکیس چوبووە کە لە سەرەتادا هەمان بو.

ئێمە یەکترمان خۆش دەویست، بەڵام لەسەر هەشت سیلیندەر ئیشمان نەدەکرد. بەڵکو دەتوانم بڵێم لەسەر سێ سیلیندەر ئیشمان دەکرد. ئێمە یەکترمان خۆش دەویست، بایەخمان بە یەکتردەدا، بەڵام هیچ هەستێکمان نەبو.

لەبەرچی؟

قەیرانێکمان هەبو. ئێمە زۆر عاشقی یەکتر بوین. هەرکاتێك خۆمان بە هاورێکانمان بەراورد دەکرد، بەلای ئەوان و خۆشمانەوە ئاشکرابو کە ئێمە یەکترییمان زۆر خۆش دەوێت. بەڵام ئەو کۆمپانیایەی کە هاوسەرەکەم لەگەڵیدابو، کە ساڵانە سەدان هەزار دۆلاری پەیدادەکرد، لەپڕ دەرگاکانی داخست و ئێمە ناچاربوین شێوازی ژیانمان بگۆڕین. (داوگ) چووە ئەشکەوتەکەیەوە، و لەبەرئەوەی من پێویستم بە خزمەت و بەئاسودە کردن و بەوە هەبو پێم بڵێن (نیگەران مەبە ئازیزەکەم، هەمو شتێك چارەسەردەبێت) ڕێك دوای دەکەوتم بۆ ناو ئەشکەوتەکەی. من وامدەزانی کە بەوجۆرە یارمەتی دەدەم.. کاتێك دەچومە ئەشکەوتەکەیەوە وامدەزانی من باشترین هاوسەری دنیام. من چیرۆکی ژنە بەهێزەکانم خوێندبۆوە .. بۆچی هاوسەرەکەی (ئەدیسۆن) هەمو پارەکانی بۆ کارەکەی (ئەدیسۆن) دابین دەکرد. من وامدەزانی کە بەوجۆرە دوای دەکەوم یارمەتی (داوگ) دەدەم.

### کاتێک دەچومە ئەشکەوتەکەیەوە وامدەزانی من باشترین هاوسەری دنیام

ئەوەبو کە کتێبەکەی (جۆن گرەی)م دۆزییەوە. هاورێیەکم باسی کتێبی (پیاوان لە مەریخەوە هاتون و ژنان لە ڤینۆسەوە)ی بۆ کردم و من لەبیرمدا هەڵمگرت چونکە ئەگەر هاوسەرگیرییەك هەبوبێت ڕێزم لێگرتبێت هاوسەرگیرییەکی ئەو بو: هاوسەرگیرییەکی خۆشەویستانە و بایەخپێدەرانەبو. کاتێك لە کتێبفرۆشێك کتێبەکەم بینی، داوام لە هاورێیەکم کرد بە هاوبەشی کتێبەکە بکڕین .. تا ئەوکاتەی بزانم چی دەکەم و لە دڵی خۆمدا کەچی گوتم "(ماری)، تۆ هاوسەرەکەت ئەوەندە زۆر خۆش دەوێت کەچی دەتەوێت پارەی کتێبەکە بە نیوەیی بدەیت؟ ئەوە قسەیە!"، بێ گوێدانە ئەوەی قەیرانی دارایم هەیە یان نا، کتێبەکەم کڕی. لەکاتی خوێندنەوەیدا، بۆم دەرکەوت کە من بەراستی زیانم بە (داوگ) گەیاندووە، زۆر زیانم پێگەیاندووە. من

وامـدادەنا کـە ئـەو پاشەکشـە کردنەکـەی مانـای وایـە، مـن و هـەمو خێزانەکـەی بەجێهێشـتووە. لەکاتێکـدا ئـەو سـەرقاڵی ئـەوە بـوە کێشـەکان چارەسـەر بکـات و بـە باشترین شێوە کە بتوانێت ئێمە بپارێزێت. من پێشتر هیچم لەمبارەیەوە نەدەزانی.

مـن تـەنیا وامـدەزانی کـە (داوگ) روخـاوە. مـن زۆرجـاری دیکـەش ئـەو بۆچـونەم هەبووە. من خۆم پەیوەندیکەرێکی داهێنـەرم و چـەند فێڵێکـی تایبـەت بـەخۆمم هەیـە بۆ ئەوەی وا لـە خـەڵك بکـەم باسـی هەسـتەکانیانم بـۆ بکـەن. بـەڵام هاوسـەرەکەی خـۆم هەرگیز هەسـتەکانی خـۆی بـۆ بـاس نـەدەکردم - نـە بـۆ مـن و نـە بـۆ کەسـی دیکـە. کـە پاشەکشەی دەکرد - بۆ ناو ئەشکەوتەکەی کە ئێستا دەیزانم - دەمگوت (جیابۆتەوە لـێم) وامدەزانی ئەمـە لـەتبونێکی جدییـە و تۆمـەتبارم دەکـرد: (مـن تێناگـەم بۆچـی لـە مـن جیابویتـەتەوە. ئیمە یـەکتریمان خـۆش دەوێـت و تـۆ منـت بـەجێهێشـتووە. نـاتوانم سـێ وشەت لێ دەربهێنم؟) ئێمـە زۆر یـەکترییمان خـۆش دەویسـت، بـەڵام لـە نـاوەوە هـەرگیز بەراستی دڵنیا نەبوم کە ئەو منی خـۆش دەوێـت. ئێسـتا تێدەگـەم کـە ئـەو تـەواو دڵنیـا نەبووە لەوەی من ئەوم قبوڵە. ئەو وایزانیوە کە رەنگە هاوسەرێکی زۆرباش نەبێت.

**کە پاشەکشەی دەکرد - بۆ ناو ئەشکەوتەکەی**
**کە ئێستا دەیزانم - دەمگوت (جیابۆتەوە لێم)**

ئەمە هەموی هەڵەبو. هەڵەیەکی تەواو.

دووەم شت کە نەمدەزانی و بۆم دەرکەوت لـەبارەی خۆمـەوەبو. ئێسـتا مـن کەسـێکی خاوەنکـاری زۆر زیـرەك و سـەرکەوتوم - لەوناوچـەیەدا زۆر بـەهێزم. بـڕوام وابـو - کـە ئەمە گەورەترین هەڵەیە ! - ئەوە بەشـی کارەکەمـە کـە (داوگ) خۆشـی دەوێـت و ڕێـزی لێدەگرت. بەڵام ئەو خۆشەویستی و ڕێزە هیچ پەیوەندی نـەبو بـەو لایـەنی کـارەوە کـە لەمنـدا بـو. لەراسـتیدا ئێسـتا دەبیـنم کـە ئـەو لایەنـە زیـانی بـە هاوسـەرگیرییەکەمان گەیانـدووە. بـەڵام بـە دڵنیاییـەوە جاران ئەمـەم نـەدەزانی. مـن دەترسـام کـە وازی لێ بهێنم، دەترسام لە گۆڕان، نیگەران بوم لەوەی شتێك لە دەست بدەم.

دوای کتێبەکە چوم بۆ یەکێك لە سیمینارەکانی (جۆن)و لـەوێ شـتێکی زۆر بچوکی

ئەنجامدا، ئەوەندە بچوك بو كە رەنگە ژنـەكانی دیكە لـە ماناكەی تێنەگەیشتبن. ئـەو ژنێكی لـەلابو كـە خـەریكی (جوكـە جـوك) كـردن بـو - كـە ئـەو زمانەیـە ئێمـە قسـەی پیـدەكـەین. و پیاوەكـانیش مرەمرەدەكـەن. لـە پــڕ ئــەو جوكەجوكانــە لــە منــەوە دەهاتنەدەرێ، ئەو دەنگە شیرینانە، ئەوانە زۆرگرنگ بـون. مـن وامـدەزانی ئەگـەر ئـەوە بكـەم شـتێك لـە هاوسـەرگیرییەكەمدا لـە دەسـت دەدەم، بـەلام نـا: ئێسـتا دەچـریكێنم. جـاران كچێكی كـوڕانی بـوم بـەلام ئێسـتا دەچـریكێنم - رێـك وەكـو ئـەو كاتـەی لەگـەڵ (داوگ)دا ژوانمان بەست چریكاندم. دوای ئەو سیمینارە هەلێكم بە دەستهێنا بـۆ ئـەوەی وەكـو كچـە خۆشەویسـتە منالەكـە رەفتـار بكـەم، و لـە پـڕ مێـردێكم بـۆ پەیـدابو كـە بۆڵەبۆڵی بەسەردا دەكردم و لە كاتی تەماشاكردنی فلیمدا دەستی دەكردە ملم.

**مێردێكم بۆ پەیدابو كە بۆڵەبۆڵی بەسەردا دەكردم و
لە كاتی تەماشاكردنی فلیمدا دەستی دەكردە ملم.**

كەواتە ئێستا ئێمە لە كوێین؟ شتێكی چاوەڕواننەكراوە، ئێمـە ئێسـتا لـە ناوەڕاسـتی گۆڕانێكی گەورەی دیكەداین: (ریچارد)ی كوڕمـان ئایـدزی هەیـە. بـەلام لـە نێـوان مـن و (داوگ)دا تێگەیشـتنێكی نـوێ هەیـە. ئێسـتا كاتێـك ئـەو دەچـێتەوە ناوئەشـكەوتەكەی هەست ناكـەم كـە لـێم جیادەبێتـەوە. لەراسـتیدا، كاتێـك ئـەو كـارە دەكات وام لێدەكـات شانازی بكەم چونكە دەزانم ئەو پیاوە و هەست بە ئاسایش دەكـەم كاتێـك لەوێیـە. مـن نامەوێت بچمە ناو ئەو ئەشكەوتەوە. نامەوێت ناخی ئازار بدەم. هەست دەكـەم كـە زۆر بەختەوەرم چونكە بڕواناكەم ژنێكی زۆر هەبن؟ بەم دۆخەی منـدا تێپـەڕیبن و هێشـتا مێردەكەشیان عاشقیان بێت.

ئێمـە ئێسـتا ئەوەنـدە بـەهێزین كـە بتـوانین روبكەینـە ئـەم بارودۆخـە نوێیـەی كوڕەكـەمان، كـە ئێسـتا گەڕاوەتـەوە مالـەوە بـۆ لامـان. مـن و ئـەو زۆر قسـە دەكـەین. بەراسـتی ئەمسـاڵ خۆشـترین ئـەزمونی ژیانمـە كـە لەگـەڵ كوڕەكەمـدام. رۆحێكـی نەرمونیانی هەیە و كەسێكی باشـە، و بـەدوای جوانییەكـەی كەسـێتی خۆیـدا دەگـەڕێت. ئـەوەی لـە (جـۆن گـرەی)ەوە لـە بـارەی (داوگ)و پیـاوان و ژنانـەوە فێـر بـوم یارمـەتیم

دەدەن بزانم کە منالێکی چەند نایابم هەیە.

(ریچارد) لە کاتی پشکنین و لێکۆڵینەوەی ژیانی خۆیدا پێی گوتوم کە هەستی کردووە لە زۆرشتدا کەموکوڕی هەیە. بەڵام بەهۆی ئەو شتانەوە کە فێریان بوم تێدەگەم کە ئەو یەکێکە لە هەرە بەهێزترین پیاوەکان، کە تا ئێستا بینیومن. کتێبەکەی (جۆن) یارمەتی دام خاڵە بەهێزەکانی (ریچارد) نیشانی خۆی بدەم - بەرامبەر بە بەرکەوتنی بێمەرج، بەرامبەر بەوەی کەسێکی هەستیارە، بەرامبەر بەوەی چۆتە ئەو شوێنە ترسناکانەی کە براکەی ناچێت، بەرامبەر بەوەی دەڵێت نەخێر کە ئەگەر ویستی بڵێت نەخێر، کە ویستی بڵێ بەڵێ دەڵێت بەڵێ، بەرامبەر بینین و نرخاندنی ئەو خۆشییەی دەڵێت بەهۆی فێربونی راستییەکانەوە لە چاوەکانمدا بەدییان دەکات. (ریچارد) (جۆن گرەی)ی خۆش دەوێت چونکە ئەو خۆشییە دەبینێت - و ئەمەش نیعمەتە مرۆڤ بتوانێت دڵی خۆش بێت کاتێک منالێکی نەخۆشە، و بەبێ رەنج و ناڕەحەتی روبەروی مەرگی منالێك ببیتەوە.

**کتێبەکەی (جۆن) یارمەتی داوم کە خاڵە**
**بەهێزەکانی کوڕەکەم نیشانی خۆی بدەم.**

کەواتە (جۆن گرەی) هەمو شتە سەرەتاییەکانی داومەتێ کە لەگەڵ (داوگ)دا هەم بو کاتێك یەکەمجار یەکترمان خۆش دەویست. هەر ئەویش نەرمونیانیەکەی پێبەخشیم کە جاران هەمبو. ئەو فێری کردم کە لەگەڵ (ریچارد) دابم و هەمو رۆژێك قسەی لەگەڵدا بکەم، وەك ئەوەی منالێکی سێ سالان بێت و هاتبێتە باوەشمەوە. هەمویان پێکەوە بەستراونەتەوە.

(داوگ) هێشتا بێدەنگە، لە جاران بێدەنگترە. هێشتا خۆی زۆر دەرنابڕێت. بەڵام هەر ئەم بەیانییە، کە هێندەی نەماوە بۆ کریسمس، هات و پێی گوتم (هانێ ئەمە باشترین دیارییە کە بە تۆی دەدەم (ماری). من ئەم بەیانییە و هەمو بەیانییەکانی دیکە دەبەخشم بە تۆ بۆ ئەوەی قسە لەگەڵ (ریچارد)دا بکەیت.) بە تەواوی راست بو. ئەو ژیانی منی ئارام کرد بۆ ئەوەی بتوانم چەند پێویستم پێیە و حەزم لێیە قسە

لەگەڵ (ریچارد)دا بکەم.

هەمو تەمەنم، کە پەنجاوشەش ساڵە، بۆئەوە گەڕاوم کە چۆن ژنبم، هاوسەر بم و دایك بم. (جۆن گرەی) پارچەکانی ئەم (پەزڵ)ەی کۆکردۆتەوە و پێکی ناونەتەوە.

بەهەرحاڵ، شتەکان لە باش دەچن.

پێکەنیناویترین شت رویدا! ئێمە ئوتومبێلێکمان لە هاوڕێیەکی خۆمان کڕی و بە جیا لە (جۆرجیا)وە گەڕاینەوە. من کاسێتێکی (جۆن گرەی)م پێبو کە خستبومە ئوتومبیلە تازەکەوە و (داوگ) ئوتومبیلەکەی برد و رۆی... و بۆم دەرکەوت - ها! - نەیتوانیبو تەسجیلەکە بکوژێنێتەوە و نەشیتوانیبو کاسێتەکەی لێ دەربهێنێت.

بەم جۆرە نۆ کاتژمێر بەردەوام کاسێتەکەی لێ دابو! نۆ کاتژمێر گوێی لە (جۆن گرەی) گرتبو. نۆ کاتژمێر لە (جۆرجیا)وە تا (فلۆریدا) بە تەسجیلێکەوە کە نەدەکوژایەوە! من کە لە دوای ئەوەوە ئوتومبیلەکەم لێدەخوڕی نەمدەزانی چی لە (داوگ) رودەدات. و کاتێك گەیشتەوە ماڵێ، دوای نۆکاتژمێر گوێگرتن یەك دێڕونیوم لێ بیست. ساڵی پێشتر ئەوە منی دەترساند. بەڵام ئەمڕۆ، ئەمە بو بە گەورەترین پێکەنین!

## ٦

## سڵاو لە مەریخ و ڤینۆسەوە

گرنگی زانینی ئەوەی کە چۆن پیاوان و ژنان بە شێوەیەکی جیاواز لەیەکتر خۆشەویستی وەردەگرن و دەیبەخشن، بابەتێکی دووبارەی ناو چیرۆکی سەرکەوتنەکانی کەپڵە عاشقەکانە. تێگەیشتن لەوەی پیاوان لە مەریخەوە هاتون و ژنان لە ڤینۆسەوە لە گەشەپێدانی دەستبەجێی هەمو پەیوەندییەکدا پێکهێنەری سەرەکی بووە. ئەگەر تۆ بتەوێت بچیت بۆ هەر هەسارەیەك، بە دڵنیاییەوە یەکەم شت دەبێت لێکۆڵینەوە لە زمانی دانیشتوانەکەی بکەیت، لە کلتور و لە دابونەریتیان. بەبێ ئەم زانیارییە گرنگە جارلەدوایجار و بەبێ ئەوەی بەخۆت بزانیت ئازار بەخەڵك دەگەیەنیت و پەیوەندییەکانی خۆت تێکدەدەیت. بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی سەرکەوتو سڵاو لە مەریخ و ڤینۆسەوە بهێنین و بە ئاشتی و خۆشەویستی پێکەوە لەسەر زەوی بژین، پێویستە یەکەم شت بزانین کە هاوبەشەکەمان بەراستی چی پێویستە.

کە تۆ کەسێکت خۆش دەوێت، بە شێوەیەکی سروشتی بەجۆرێك مامەڵەی لەگەڵدا دەکەیت کە خۆت دەتەوێت ئاوا مامەڵەت لەگەڵدا بکرێت. ئەم ئارەزووە بەسۆزە زیانی دەبێت ئەگەر داخوازییەکانی ئێمە پێچەوانەی داخوازییەکانی هاوبەشەکەمان بن. بەڵام لە پەیوەندییە سۆزدارییەکاندا، ئێمە بە شێوەیەکی زۆر ئۆتۆماتیکی ئەوە بە هاوبەشەکانمان دەبەخشین کە خۆمان دەمانەوێت و مەرج نییە ئەوەبێت کە ئەوان دەیانەوێت و پێویستیان پێیە. تێگەیشتنێکی روون لە جیاوازییەکان هانمان دەدات فێری پێویستییە بێ وێنەکانی هاوبەشەکانمان ببین و رێزیان لێبگرین، لەبری ئەوەی بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی وا دابنێین کە دەیانزانین.

بەبێ تێگەیشتنێکی قوڵتر کە چۆن خۆشەویستی وەربگرین و بیبەخشین، بەردەوام بێئومێد و نارەحەت دەبین. زۆر ئاسانە تۆ ئەو شتانە فەرامۆش بکەیت کە زۆر گرنگن بەلای هاوبەشەکەتەوە چونکە لە رووی غەریزەوە پێویستی و ریزبەندی دیکەشمان هەن. دوای خوێندنەوەی کتێبی (پیاوان لە مەریخەوە هاتون) پیاوان گرنگی ئەوەیان بۆ دەرکەوتوە کە وابکەن ژن هەست بکات تایبەتە و بایەخی پێدەدرێت، رێزی لێ دەگیرێت، و لێی تێدەگەن؛ ژنانیش فێری ئەوەبون چەند گرنگە متمانە بە پیاو بکەن، قبوڵی بکەن و بینرخێنن. پیاو فێربو فۆکەس بکاتە سەر ئەو شتانەی کە دەڵێن (من بایەخدەدەم) لە کاتێکدا ژن جەختێکی تایبەت دەکاتە سەر ئەوەی کە وەڵامدانەوەی بۆ

کارەکانی پیاو بە جۆرێك بێت کە دەڵێت (من دەنرخێنم).

بیستنی چیرۆك و نمونەی ئەم کەپلانەی کە سەرکەوتووانە خۆشەویستییان بۆیەکتر هەیە نەك تەنیا ئیلهامبەخشە بەڵکو جارێکی دیکە بەیادمان دەهێنێتەوە ئەو رێگە زۆر و جیاوازانەمان  کامانەن بە هۆیانەوە هاوبەشەکانمان خۆشبوێت.

## ئەو وام لێ دەکات هەست بکەم تایبەتم

(دێبی) باسی هاوسەرگیرییەکی کرد کە لەسەرەتاوە سەرکەوتوبو. "پێش ئەوەی هاوسەرگیری بکەین، (سپێنسەر) لەگەڵ دایە گەورەی مندا بە تەلەفۆن قسەی کرد و دایە گەورەم پێی وت "تۆ نازانیت (دێبی) چەند تایبەتە. تۆ نازانیت چەند نایابە" (سپێنسەر) قسەکەی پێبڕی و گوتی "دایە گەورە من بە نیازم وەکو شاژن رەفتاری لەگەڵدا بکەم" وایکرد. ئەو وا رەفتارم لەگەڵدا دەکات کە من بەراستی هەست بکەم تایبەتم.

من پێشتر هاوسەرگیرییەکی دیکەم کردبو، لەگەڵ کەسێکدا کە بە تەواوی هاوبەشێکی هەڵەبو بۆ من. کەسێکی شیرین و باشبو، بەڵام هەریەکەمان لەکۆتاییەکی مەوداکەوە هاتبوین. لە هەمو رەهەندێکی ژیانماندا لەوپەڕی جیاوازییدا بوین. دواتر بۆم دەرکەوت کە خەڵکی ناو ئاهەنگی هاوسەرگیرییەکەمان گرەویان دەکرد لەسەر ئەوەی هاوسەرگیرییەکەمان چەند درێژە دەکێشێت. هەمو کەسێك جگە لەخۆم ئەوەی دەبینی کە من ساڵێك لە پاش هاوسەرگیرییەکە بینیم.

دوای جیابونەوەکە، من دڵخۆشترین رەبەنی ئەمریکا بوم. من زۆر دڵخۆشبوم کە ئازاد بوبوم! باوەڕم نەدەکرد بێجگە لە من رەبەنێکی دیکە هەبێت چێژ لەوە ببینێت کە رەبەنە - هەمویان نەگبەتبون، دەیانویست هاوسەرگیری بکەن. بەڵام من تەنیا دەمویست ژوان ببەستم. من کاتێکی مەزنم هەبو. جار لەدوای جار پیاوی چاکترم دەبینی. هەر پیاوێکم دەدۆزییەوە لەوی پێشتر گونجاوتر بو. بەڵام دواتر کەسێکم بینی کە بەتەواوی لە دەرەوەی دەستپێگەیشتنی مندابو. من خۆشم دەویست و زۆر بەراستی دەمویست. ئەمە ئەو کاتەبو کە بڕیارمدا ریکلامی تاکەکەسی دەربکەم.

### پێی گوتم ئامادەیە بۆ هاوسەرگیریی.
### ئەو دەیویست هەمیشە پێکەوە بین

ریکلامی تاکەکەسی رێگەیەکی مەزنە بۆ بینینی خەڵك: تۆ ئەو قسانە دەکەیت کە دەتەوێت بیانڵێیت، بە تەواوی لە کۆنترۆڵدایت، و بەراستی دەتوانیت ئەوە دەربڕیت کە بۆی دەگەڕێیت. من دەمزانی چیم دەوێت: ژوانێکم دەویست هەمو شەوێکی شەمە و پاشنیوەڕۆیەکی یەکشەمە و شەوی سەری ساڵ و کەسێك بتوانێت لەگەڵمدابێت بۆ ئاهەنگی هاوسەرگیرییەکان و بارِ و مەراسیمی ماتەمینییەکان. رەنگە تەنانەت حەزم لەوەشبێت هەفتەی شەوێکیش لەلای بمێنمەوە.

بەڵام کاتێك (سپێنسەر)م بینی. پێی گوتم ئامادەیە بۆ هاوسەرگیریی. ئەو دەیویست هەمیشە پێکەوە بین ئەو ساڵونیوێك لەوەوبەر جیابوبۆوە دوای هاوسەرگیرییەك کە سی ساڵی خایاندبو و دەیویست دوبارە بچێتەوە ناو هاوسەرگیری. گوتم نەخێر، من ئەوەم نەدەویست. ئەوەبو پێی گوتم کە تەنیا بۆ ماوەیەك دەمێنێتەوە، بۆ ئەوەی بزانێت ئایا بڕیارەکەم دەگۆڕم یان نا.

من بەم قسەیە هەستم بەجۆرە هەڕەشەیەك کرد، بەڵام هەستم کرد کە حەزم لێ بو لەگەڵمدا بێت. من پێم خۆش بو بیبینم زیاتر لەوەی وەك لە داخوازییە بنەڕەتییەکانمدا باسم کردبو. ئێستاکەش زۆر شتێکی خۆشە چونکە هەرکاتێك چوبین بۆ هاوسەرگیرییەك یان بۆ ماتەمینییەك، هەمیشە دەیپرسی ئایا بۆ تایبەتمەندییەکانی کارەکە گونجاوە و کارێکی باش ئەنجامدەدات و من بەدڵمە؟

لەراستیدا زوو بۆم دەرکەوت ئەمە ئەو پیاوەیە کە دەتوانم هاوسەرگیری لەگەڵدا بکەم. بە شێوەیەك دایك و باوکم سوپاسیان دەکردم لەسەری. ئەوان هاوسەرگیرییەکی ناخۆشیان هەبو و (تەنیا لەبەر خاتری منداڵەکان) پێکەوە مابونەوە. من لێیان پاڕامەوە کە لەیەکتری جیاببنەوە. کاتێك کە لێیان دەپرسین چیماندەوێت بۆ کریسمس، دەمانگوت (جیاببنەوە!) بۆیە لەوانەوە فێربوم کە پێویستە هاوسەری یەکەمم بەجێبهێڵم، چونکە ئەو هاوسەرگیرییە بەرەو سەرکەوتن نەدەچو. بەم شێوەیە تێگەیشتم کە ئەم هاوسەرگیرییە لەگەڵ (سپێنسەر) بۆ من گونجاوە. شتەکان لە سەرکەوتندا بون. هەرگیز

نەمدەزانی هاوسەرگیری دەشێت بەم شێوەیە بێت، چونکە هەرگیز هاوسەرگیری لەم جۆرەم نەبینیبو. بەڵام دەمزانی ئەوەی رودەدات شتێکی (راست)ە.

**هەرگیز نەمدەزانی هاوسەرگیری دەشێت**
**بەم شێوەیە بێت، چونکە هەرگیز**
**هاوسەرگیری لەم جۆرەم نەبینیبو.**

ئەمە پێکەنیناوییە. زۆربەی خەڵك حەز دەکەن نوسینەکانی (جۆن گرەی) بخوێننەوە لەبەرئەوەی کێشەیەکیان هەیە و هەوڵ دەدەن چارەسەری بکەن. بەڵام کاتێك کتێبی (پیاوان لە مەریخەوە هاتون و ژنان لە ڤینۆسەوە)م بینی حەزم لە خوێندنەوەی کرد چونکە ئەو باوەڕەی لەلا بەهێزکردم کە ئەوەی من و (سپێنسەر) دەیکەن بەراستی سەرکەوتووە. هەروەها بۆم دەرکەوت بۆچی کارەکان لەنێوانماندا سەرکەوتووە. تەنانەت ناونیشانەکەش وای لێکردم کە بزانم، بەڵێ، ئێمە لە دوو هەسارەی جیاوازەوە هاتوین و تەنیا هەر ئەم پیاوە جیاواز نییە بەڵکو هەمو پیاوان جیاوازن. شتەکە بەم شێوەیەیە، بۆیە گرنگ ئەوەیە کە واقیعەکە قبوڵ بکەیت و بەردەوام هەوڵ ئەدەیت بیگۆڕیت. ئەم جۆرە قبوڵکردنە بەتەواوی گونجاوە لەگەڵ سروشتی ئێمەدا. ئەمە ئەو شتەیە کە بیرمان لێ کردۆتەوە، لە ژیانی رۆحیماندا لێمانکۆڵیوەتەوە و ئەنجامانداوە. قبوڵکردنی واقیع ئەوکارە بو کە ئێمە دەمانکرد.

بابەتێکی دیکە ئامرازەکان بو. رەنگە گرنگترین شارەزایی پەیوەندیکردن کە (جۆن گرەی) باسی لێوەدەکات بریتی بێت لە گوێگرتن. ئەوەی من لە هاوسەرەکەمدا دەیبینم پیاوێکە بە شێوەیەکی سروشتی گوێدەگرێت. وادەزانم کە من بە شێوەیەکی نائاسایی بەختەوەرم کە ئەوم دۆزیوەتەوە. کتوپڕ هەست دەکەم گوێم لێدەگرێت، نەك لەسەر رێڕەوێکی هاوتەریبم لەگەڵ پیاوێکدا، و بەراستی یەکتری نەبڕین. من و (سپێنسەر) لەسەر هەمان شەمەندەفەر بوین. ئەوەی ئەمانە کۆدەکاتەوە ئەو لیستەیە کە ئەو لە جزدانەکەیدا هەڵی دەگرێت تیایدا ئەو شتانە نوسراوە کە دەیەوێت بۆ منی بکرێت تا

(سپێنسەر) دڵخۆشم بکات. ئەوەندە بە وردی گوێ بۆ قسەکانم دەگرێت، نەك هەر ئاخاوتنەکانی نێوان هەردوکمان بەڵکو گوێ لەو قسانەش دەگرێت کە لەگەڵ خەڵکیدا دەیانکەم. ئەم تێبینییە بچوکانە هەڵدەگرێت و دەیاننوسێت بۆ ئەوەی لەبیری نەچێت. دەڵێم (ئۆه، من ناسکترین شتم بینی). (سنجاقێکی زۆرجوان بو لە فلانە کۆگا) یاخود (من زۆرم حەز لەو گۆرانییەیە.) و ئەو دەنوسێت (سنجاق لە کۆگاکە) یاخود ناونیشانێکی تایبەت. ئەو هەمیشە بە شتی چاوەڕواننەکراو و پەیام و شتی تایبەت سەرسامم دەکات، دەبێت زۆر وریابم لەوشتانەی دەیانڵێم!

**ئەم تێبینییە بچوکانە هەڵدەگرێت و**
**دەیاننوسێت بۆ ئەوەی لەبیری نەچێت.**



هەروەها گوێ لەوشتانەش دەگرێت کە ئازارم دەدەن. یەکێك لەو شتانەی رقم لێ بو پارچەنان بو لەسەر جێگاکە. ئەوەبو فلچەیەکی کڕی و لای خۆیەوە هەڵیواسیوە. ئەو کەسێکی رۆمانسی و بیرکەرەوەیە و گوێدەگرێت. کردارەکانی سەلمێنەری ئەو راستییەن کە بەراستی گوێدەگرێت.

ئەو شتانەی کە پێکەوە دەیانکەین؟ ئۆه، پاسکیل لێخوڕین، شاخەوانی و یاری. کاتێکی زۆر خۆش بەسەر دەبەین و زۆر حەزمان لە پێکەنینە. هەوڵ دەدەین رێگە بدۆزینەوە بۆ ئەوەی یەکتری بخەینە پێکەنین، و هەردوکمان گەشبینین، ئەمەش زۆر یارمەتیدەرە. یەکێك لەوشتە تایبەتانەی کە پێکەوە دەمانبەستێتەوە. ئەوەیە هەردوکمان شوکرانە بژێرین. بۆ نمونە، دەستمان کردووە بەوەی پێش نانخواردن نزا بکەین، و ئێستاش ئەو دەرفەتەیە کە بڵێین سوپاسگوزارین. نەك تەنیا بۆ خواردنەکە، بەڵکو بۆ یەکتر، بۆ شوێنی ژیانمان، بۆ ئەوەی کە ئەوەندەمان پارە هەیە دەتوانین بەشێکی بدەین بەوکەسەی پێویستی بە یارمەتییە. هەفتەی جارێکیش کارێکی خۆبەخشانە دەکەین، لە چێشتخانەیەکی خۆڕایدا کاردەکەین و کاری دیکە دەکەین بۆ ئەوەی ئێمەش خزمەتی کۆمەڵگە بکەین. ئێمە ئەوە وەك پاپەندییەکی خۆش دەبینین

کە دەتوانین پێکەوە ئەنجامی بدەین. ئەمە بەختە، بە جۆرێك، کە دەتوانین کات تەرخان بکەین بۆ ئەم کارە و یارمەتیمان دەدان زیاتر پێکەوە ببەسترێینەوە چونکە ئەم ئەزمونە هاوبەشەشمان هەیە. بەڵێ، من هەمو رۆژێك نیعمەتەکان دەژمێرم.

من نازانم کە داهاتومان چۆن دەبێت. (سپێنسەر) نزیکەی بیست ساڵ لە من گەورەترە. واتە کاتێك ئەو لە کارەکەی دوردەکەوێتەوە من لە بواری کارەکەمدا لە لوتکەدام. ئەو کاتێکی بەچێژتر دەبینێت وەك لە من. ئەمە شتێکە کە جارجار دێتە پێشەوە، دڵنیام، و ئێستاش بە متمانەوە تەماشای داهاتوم دەکەم. نازانم لە پانزە ساڵی داهاتودا چی دەکەین، بەڵام دڵنیام کە هەرچییەك بکەین پێکەوە دەیکەین.

ئەمە وام لێدەکات سوپاسگوزاربم کە (سپێنسەر) زۆری خۆش دەوێم. هەوڵی زۆر دەدات بۆ ئەوەی شتی جوانم بۆ بکات، و کە دەیکات دڵنیام بۆ ئەوەیە کە دڵخۆشم بکات. ئەمە وام لێدەکات بە ئاگابم داوای شتی زیاد لە پێویست نەکەم، تەنیا زانینی ئەوەی کە ئەو بایەخم پێدەدات ئیلهامی ئاسودەییەکی زۆرم پێدەبەخشێت بە دڵنیاییەوە دەزانم کە ئاساییە ژنان سوپاسگوزاریی دەربڕن، وەك (جۆن گرەی) دەڵێت، خۆشحاڵیشم کە (جۆن) ئەو شارەزاییەی فێری خەڵکی دەکات.

**زانینی ئەوەی کە ئەو بایەخم پێدەدات ئیلهامی ئاسودەییەکی زۆرم پێدەبەخشێت**

من هەمو رۆژێك نیعمەتەکان دەژمێرم، بەڵام ئەوەی لە هەموشتێك زیاتر سوپاسگوزارم بەرامبەری، پێموایە ئەوەیە کە (سپێنسەر) گوێم لێ دەگرێت.

پێویست ناکات باسی ئەو راستییە بکەم کە هەمو شەممە و یەکشەممە و شەوانی سەری ساڵێك ژوانم هەیە!

## نەماندەتوانی واز لە شەڕکردن بهێنین

(شێری) ئەمەی گێڕایەوە: من وەك (دەیڤ)ی هاوسەرم سەردانی راوێژکارێکی هاوسەرگیریمان دەکرد. نەك لەبەرئەوەی کە یەکتریمان خۆشنەدەویست، بەڵکو لەبەرئەوەی کە نەماندەتوانی بەتەواوی بگونجێین. بێئەقڵییەکەمان ئەوەبو کە لەسەر

شتی لاوەکی شەڕماندەکرد. ئەم مشتومڕانە پەیوەندییەکانی نێوانمانی لاواز کردبو. لەبەرئەوەی من پلەی ماستەرم لە راوێژکارییدا بە دەستهێنابو، بەلامەوە کەمێك سەختبو کە کێشەکەم دەربڕم. هەرچۆنێك بێت، پێویستە من باشتر بزانم راستە؟ هەڵەیە! ئەمە ئەو چیرۆکە کۆنەیە لەبارەی ئەو دکتۆرەوە کە چارەسەری خۆی دەکات؟

ئەوەی راستی بێت منیش نەمدەتوانی کێشەکەی خۆمان چارەسەر بکەم، لەبەرئەوە دەچوین بۆ راوێژوەرگرتن. هەفتەیەکیان چارەسەرکارەکەمان پێی گوتین کە کتێبەکەی تۆ بخوێنینەوە. دوای ئەوەی دەستم پێکرد، پەلەمبو دەست بکەم بە قسەکردن لەسەری. زۆری پێنەچو وامان لێهات لە هەمو مەسەلەیەکدا ئاماژە بە کتێبەکە بکەین.

شتێکی دەگمەن نەبو بۆ ئێمە کە قسەی لەم جۆرە بکەین وەك (وابزانم تۆ لە ئەشکەوتەکەتدایت؛ کاتێك کە گەڕایتەوە پێم بڵێ)، یاخود (من باشم، هەرئەوەیە لە ئەشکەوتەکەمدام)، یاخود (بەردەوامبە و قسە بکە؛ دەزانم ئەمە شتێکی ڤینۆسییە.) زۆر بەلامانەوە سەیربو کە ژیانمان هێندە چاك بووە. تەنیا بە تێگەیشتنێکی کەم لە هەڵسوکەوتی هەریەکەمان، لەپڕ توانیمان رێگە لە زۆربەی مشتومڕەکانی جارانمان بگرین و توانیمان راوێژ وەرگرتنەکە بەجێبهێڵین.

**وابزانم تۆ لە ئەشکەوتەکەتدایت؛ کاتێک کە گەڕایتەوە پێم بڵێ**

هاوینی پێشو، لێپرسراوەکەم کۆبونەوەیەکی گرێدا لە (پورتۆ ریکۆ). دەبو منیش بەشداربم، و هاوسەرەکەم بانگێشتکردبو. یەکەم رۆژمان لەسەر دورگەکە، تەکسییەکی ئاوییمان گرت و پێی پەڕینەوە بۆ دورگەیەکی تایبەت بۆ (گەشت و سەیران). لەوکاتەدا کە لە تەکسیە ئاوییەکە دادەبەزین، چاومان کەوت بە یەك دوو هاوکارم کە لەگەڵ هاوبەشەکانیان هاتبونە ئەوێ، بۆیە هەمومان پێکەوە دەستمان کرد بە گەڕان بەناو دورگەکەدا. پێویستە ئەوە بڵێم، ئێمە هەمومان پێکەوە دەستمانکرد بە گەڕان جگە لە (دەیڤ).

هاوسەرەکەم بە تەنیا دەستیکرد بە گەڕان. ئەو لەبەر چاوی گروپەکە جیابۆوە و رێگەیەکی جیاوازی گرتەبەر. بۆ تاکە ساتێك ویستم دوای بکەوم و ئەوەی دەمویست

پێی بڵێم. (ئەوە کارێکی ناشرین بو کە بڕۆیت و مـن بـەجێبهێڵێت. هاوڕێکانم ڕەنگە وابـزانن تـۆ ناتـەوێت لەگـەڵ ئـەوان یـان لەگـەڵ منـدا بیـت. تـۆ بـە راسـتی منـت شەرمەزارکرد .. تاد.)

بەڵام خۆمم ڕاگرت. لەپڕ هەستم کرد کە ئـەو (چوّتەوە نـاو ئەشکەوتەکەی) شـتێکی ئاساییە کە خۆی دوربخاتەوە. ڕەنگە ئەو بە جۆرێك بە کۆی ئەو ئەزمونـە نـوقم بوبێـت و پێویستی بەوە بوبێت بۆ خۆڕێکخستنەوە کەمێك لە ئەشکەوتەکەیدا بمێنێتـەوە. باشـترین بەشـی ئەزمونەکـەش ئـەوەبو کـە تێگەیشـتم ئەگـەر بـە تـەنیا بـەجێی بهێڵم، ئـەوا کـە گەڕایــەوە باشــتر دەبێـت چـونکە دەرفـەتی ڕۆیشــتن هــەبووە. کــە گەڕایــەوە باشــترین هەڵسوکەوتی دەبێت و من بە شانازی زیاترەوە نیشانی هاوکارانمی دەدەم.

---

**لەپڕ هەستم کرد کە ئەو (چوّتەوە ناو ئەشکەوتەکەی)**
**شتێکی ئاساییە کە خۆی دوربخاتەوە.**

---

کـە لەگـەڵ هاوکـارانم بـەردەوام بـوم لـە گـەڕان، دەسـتم کـرد بـە باسـکردنی کتێبـی (پیاوان لە مەریخەوە هاتون) و باسم کرد کە چۆن ئەم کتێبە ژیانمـانی گۆڕیـوە. یـەکێك لە پیاوەکان گوتی کـە کـارێکی چاکم کـردووە ڕێگـەم بـە (دەیـڤ)داوە بـە تـەنیا بـڕوات چونکە پێویستی بەتەنیایی بووە. من سەری ڕەزامەندیم ڕاوەشاند، و هەسـتم بـە جـۆرە لە خۆبایبونێك کـرد چونکە تێگەیشتم کـە ئـەو پیـاوەش وەکـو مـەریخیـیـەك لەوشـتە تێـدەگات کـە مـن دواجـار لێی تێگەیشـتبوم. دیـارە منـی ژن لێیتێگەیشـتبوم چـونکە لـە کتێبەوە فێری بوبوم بەڵام ئـەو دەیزانـی چـونکە خـۆی پیـاو بـو. ئـەم کـرداره سـادەیەی متمانەپێکردن، بـڕوا، ڕێگەپێـدان، تێگەیشـتن — هـەر نـاوێکی لێـدەنێیت بینـێ — هـەمو گەشـتەکەمانی گـۆڕی. دواجـار (دەیـڤ) گەڕایـەوە و پەیوەنــدیکرد بــە گروپەکــەوە. بەشـەکەی دیکـەی گەشـتەکە وەکـو ئـەوەبو لەسـەر (دورگـەی فـەنتازیا) بـین. تەنانـەت شەڕیشمان نەکرد!

---

یەکێک لە پیاوەکان گوتی کە کارێکی چاکم کردووە
ڕێگەم بە (دەیڤ)داوە بە تەنیا بڕوات

تا ئێستاش ئاماژە بە کتێبەکە دەدەین. ئەمە بۆتە بەشێك لە زمانی قسەکردنی ڕۆژانەمان. ئێستا هاوڕێکانیشمان کتێبەکەیان خوێندۆتەوە، بۆیە بە شێوەیەکی ڕۆتینی ئاماژەی پێدەدەین. کۆتایی ئەم هەفتەیەی پێشو من و هاوڕێ هەرە نزیکەکانم چوین بۆ گەشتێکی یەکڕۆژەی شتکڕین. کاتێك بەرنامەمان بۆ دادەنا، (دەیڤ) پێی وتم، (کچینە ئێوە پێویستان بەوەیە بە تەنیابن. ئەمە شتی ڤینۆسییە. بڕۆن، چەند دەتانەوێ بمێننەوە. کاتێك گەڕانەوە من لەماڵەوەم.) دیارە هیچ ژنێك ناتوانێت داوای شتی زیاتر لەمە بکات!



## سێکس و خۆشەویستی

(ئەلیس) باسی ژیانە سێکسییە پەرەسەندووەکەی کرد. (ئەندرۆ)ی هاوسەرم کەسێکی بەهێز و بێدەنگە. زۆر بەلایەوە سەختە هەستەکانی دەربڕێت. ئەمە بۆ من زۆر سەخت بوو چونکە هەستم نەدەکرد خۆشیدەوێم یاخود پەیوەندیم لەگەڵدا هەیە. پاش ماوەیەك تەنانەت نەمدەویست سێکسیشی لەگەڵدا بکەم. پێویستم بە خۆشەویستییەکی زۆرە بۆ ئەوەی بوروژێم و ئامادەبم بۆئەوەی خۆمی لە روی سێکسییەوە پێببەخشم. هەروەها سەبارەت بە سەرنجڕاکێشییەکەم پێویستم بە دووبارە دڵنیا کردنەوە هەیە. بەهۆی تێنەگەیشتن لە مەریخییە بێدەنگەکان، من بێهیوابوبوم.

لەگەڵ ئەمەشدا، دوای خوێندنەوەی کتێبی (مەریخ و ڤینۆس لە ژوری نوستن) بۆم دەرکەوت کە دەتوانم هەمو ئەو خۆشەویستی و بایەخە بەدەست بهێنم کە پێویستم پێبو. تێگەیشتم کە (ئەلیس) هەمو ئەو خۆشەویستییەی هەیە کە من دەمەوێت، بەڵام ئەمە لە دیوەکەی ئەودیوی شاخەکەدایە. ئەو شاخە بریتییە لە هاوبەشیی سێکسی لە ژیانماندا.

من ئێستا هەمو ئەمانە بە سەرکێشییەکی سەرنجڕاکێش دەبینم، گەشتێك کە

پێویستم بەوەیە هەندێك لە پێویستیيەكانم دابنێم تا ئەوكاتەی بەسەر شاخەكەدا سەردەكەوین. پاشان، بە دڵنیاییيەوە، دوای سێكس هاوسەرەكەم رووخۆشە، گەرم و گوڕە و خۆشەویستە. دەبێتە پیاوێكی دیكە! تەنانەت شتی خۆشیش دەڵێت، بۆ نمونە دەڵێت "تۆ خۆشەویستێكی مەزنیت!" یاخود "تۆ زۆر جوانیت." دەمكاتە ئامێز و دەست دەهێنێت بە پشتمدا، و زۆرجار خۆی دەردەبڕێت و كاتێك لە ئامێزی یەكتردایین قسەم بۆ دەكات.

**دەمكاتە ئامێز و دەست دەهێنێت بە پشتمدا، و زۆرجار خۆی دەردەبڕێت و كاتێك لە ئامێزی یەكتردایین قسەم بۆ دەكات.**

پێویستە ئەم هەموو شتانەم لە یاد بێت، لە (كۆڵەپشت)ە خەیاڵییەكەمدا بیانپارێزم بۆئەوەی لە گەشتەكەی دیكەماندا بۆ سەر چیاكە بتوانم بوروژێم!

سەبارەت بە جیاوازی كە ئێمەی ژن حەزمان لێیە (ئەمەش هەر لە كتێبەكەوە فێربوم) هەندێك جار وا هاوسەرەكەم دەبینم وەك ئەوەی لە قەفەزێكی گەورەی ئاڵتونیدا زیندانی كرابێت. سێكسكردن ئەو كلیلەیە كە پێویستی پێیە بۆ ئەوەی ئازاد ببێت. ئەمە شتێكی سەركەوتووە!

بەڵێ! من هاوبەشێكی سێكسی ئامادەم و ئێستا دەزانم كە چۆن پێویستی و كاردانەوەكانمان جیاوازن لە یەكتری.

## دواجار دۆزینەوەی خۆشەویستی

(ڤیكتۆریا) چیرۆكەكەی خۆی گێڕایەوە. "من تەمەنم سیوشەش ساڵە، و (ئێدوارد)ی هاوسەرم چلوشەش ساڵە و ئەو هاوسەری دووەممە و منیش سێیەم ژنی ئەوم. هەرچەندە پێشتر بە چەند ئەزمونێكی ناخۆشدا تێپەڕیوین، بەڵام دواجار هەردوكمان خۆشەویستیمان دۆزیوەتەوە.

من دەزانم كە هاوسەرەكەی پێشوم بە شێوازی خۆی خۆشی دەویستم، بەڵام هەمیشە كەسی پلەدوو بوم. لای ئەو هاوڕێكانی كەسی پلەیەك بون. كە داوای زیاترم لێ

دەکــرد، ئــەو پێویســتییەکانی منــی بــە ناپەســەند دادەنــا. دوای ســەردانکردنی چارەسـەرکارێك بـۆ ئـەوەی کـار لەسـەر کێشـەکانی نـاو پەیوەندییەکـەمان بکـات، زۆری پێنــەبو. مــن خــۆم ئامــادەکرد بــەجێیبهێڵم. هــەرگیز پەشــیمان نەبومەتــەوە لــەو هەنگاوەی ناومە و هەرگیز تەماشای دواوەم نەکردۆتەوە.

"کە بۆ یەکەمجار (ئێدوارد)م بینی، هەرگیز بیرم لەوە نـەکردبوەوە پەیوەندییـەکی دیکە دروست بکەم. هاوڕێکان بـە یـەکتریان ناساندین کـە ئـەو بـە گەشـتێك لـە ئـەفریقای باشورەوە هاتبو. من ئاگاداری خۆم بوم و هەرچۆنێك بێت (ئێدوارد) لـە ئـەفریقای باشـور هاوڕێیەکی کچی هەبو. لەگەڵ ئەوەشدا کە گەڕایەوە بە تەلەفون قسەمان دەکرد و کاتێك پەیوەندییەکەی لەگەڵ هاوڕێ کچەکەیدا کۆتایی هات، بردمی بۆ ئەوێ سەردانی بکەم.

ئەوکاتە زانیمان کە تەواو بـۆ یـەکتر گونجاوین. بـەڵام سـاڵێك دوای ئـەوە (ئێـدوارد) سەردانی کـردم و هـەمو شـتێك جیـاواز بـو. ئەوکاتـە مـن کتێبـی (پیـاوان لـە مەریخـەوە هـاتون)م دەخوێنـدەوە و ئـەویش تـازە خوێندبویـەوە. شـتێکی ئـاڵۆز و باوەڕنـەکراو و ناچارییمان بەسەردا هات. وەکو دوو زەریا یەکمان گرت چونکە بـە کورتییەکـەی ئامـادە بوین، و هیچ کاتێك لەوکاتە گونجاوتر نەبو. ئیتر لەوساتەوە لەیەك جیانابینەوە.

وابیردەکەمەوە ئەوەی ئێمە لە سـەرەتادا زۆر بـە گـوڕ نـەبوین بـۆ خۆشەویسـتییەکە شتێکی زۆر یارمەتیدەربو. بە هێواشی دەستمان پێکرد و بوین بە هـاوڕێ، بناغەکـەیمان دروستکردبو بۆ پەیوەندییەکی درێژخایەن. بۆمان دەرکەوت ئەوەندە خـاڵی هاوبـەشمان هەیە کە ترسناکە. (ئێدوارد) خـەونی هـەمو ژنێـك بـو: راسـتەقینە، بـە رەحـم، گـەرم و گـوڕ، راسـتگۆ، هەسـتیار و لەگـەڵ ئەوەشـدا تونـد، بـە بایـەخ، نـەرم و نیـان، زیـرەك، بەرپرسـیار، بـە وەفـا، تێگەیشـتو، سـەرنجڕاکێش، قۆشمـە، کـراوە، هـێمن .. و چـەندین خەسڵەتی باشی دیکە.

### ئەو بە رێزەوە وەك هاوبەشێکی هاوتا مامەڵەم لەگەڵدا دەکات.

ئەو بە رێزەوە وەك هاوبەشێکی هاوتا مامەڵەم لەگەڵدا دەکات. ئێمە یەکتر لە ئـامێز دەگـرین، ئەوەنـدەی پێویسـتمان بێـت، و دەسـت دەکـەین بـە باسـکردنی هـەمو شـتێك.

هەوڵدەدەین لە هەمو ساتەکانمان هاوبەشی بکەین و چێژیان لێ وەربگرین. ئەوەی سەرکەوتووە ئەو راستییەیە کە هەردووکمان گوێ لە خۆزگە و لە خواست و پێویستییەکانی یەکتری دەگرین.

یەکێك لە داخوازییەکانی (ئێدوارد) لە من ئەوەیە کە هەرکاتێك توانیم لە دەرگاکەدا بە باوەشێکی (خۆشحاڵم کە دەتبینم)ەوە بەخێر هاتنەوەی بکەم. بەلای من، نەك هەر زۆر خۆشە کە لە کۆتایی رۆژەکەدا یان کۆتایی گەشتێکدا دەیبینمەوە، بەڵکو خۆشەویستییەکەی بۆ من گەشەی زیاتر دەکات کاتێك خۆزگەکانم بەبیردێنمەوە لە بری ئەوەی پشتگوێیان بخەم. بەم شێوەیە هێنانەدی خۆزگەکانی ئاسودەیی بە منیش و بەویش دەبەخشێت. خۆشەویستییەکەمان بۆ یەکتری بێمەرجە و هەمو رۆژێك گەشە دەکات.



رەنگە وا بیربکەیتەوە ئەم پیاوە ئەوەندە باشە تەنیا لە خەیاڵدا بونی هەبێت. بەڵام دەبێت بیناسیت بۆ ئەوەی بزانیت کەسێکی زۆر سادەیە، بێفیزە، بە بەزەیییە و نەرمونیانە و خۆشەویستی و بایەخێکی زۆر دەبەخشێت و بەهەمان شێوە وەریشیان دەگرێتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا، ناتوانم بڵێم کێشەی خۆمان نییە. نەخێر، ئێمەش وەکو هەمو کەسێکی دیکە دەکەوینە مشتومڕیشەوە. دەنگمان بەرز دەکەینەوە و رەنگە لەوساتەدا یەکتریشمان خۆشنەوێت. من هەر بەردەوام دەبم لە مشتومڕەکە تەنانەت رەنگە ئەو کاتەش کە ئەو لە ئەشکەوتەکەیدایە. بەڵام توڕەییەکەمان بەردەوام نییە و بۆ ماوەیەکی زۆر قین لە دڵ ناگرین، و هەوڵدەدەین لە یادمان بێت کە خۆشەویستییەکەمان بەهێزترە لە هەمو ناکۆکییەك، بۆیە زۆر بە خێرایی سارد دەبینەوە.

ئێستا دوای چوارساڵ لە هاوسەرگیرییەکەمان، من شەش مانگە دوگیانم. لە دۆخی وادا، ئێمەی ژنانی دوگیان دەمانەوێت لە جاران زیاتر خۆشیان بوێین و چاودێری و خزمەت بکرێین. (ئێدوارد) دێتە پێشەوە. بە بەردەوامی دەکێشێت بە سکمدا و قسە لەگەڵ مناڵەکەدا دەکات. ئەو رۆژەیان، پێشنیاری ئەوەی بۆ کردم کە کاتێك مناڵەکە لە دایك بو دەیەوێت کەلوپەلەکان بگوێزێتەوە بۆ ئەوەی شەوان ئاسانتر بتوانێت بگاتە مناڵەکە و خواردنی پێبدات. دەزانم ئەو دەبێتە باوکێکی مەزن. ئەو بەلایەوە ئاسایییە

ماڵ پاك بكاتەوە، قاپەكان بشوات، دایبی بگۆڕێت .. هەرچەندە من لە دایكایەتی دەترسم، بەڵام (ئێدوارد) وام لێدەكات هەست بكەم شتەكە زۆر خۆش و ئاسانە.

**ئێمەی ژنانی دوگیان دەمانەوێت لە جاران زیاتر خۆشیان بوێین و چاودێری و خزمەت بكرێین.**

ئێمە زۆر بەختەوەرین كە یەكتریمان دۆزیوەتەوە و ئەوجۆرە دڵخۆشی و خۆشەویستییەمان بە دەستهێناوە كە پێشتر نەمانبووە. وەك پەندەكە دەڵێت (ئەوەی تەماشا ناكات، هیچ نادۆزێتەوە.) بەڵام ئەمە هەمیشە بیریكراوە و چاویكراوە و گوێی كراوەی دەوێت.



## گێژاوێكی كلاسیكی مەریخی/ڤینۆسی

(باربارا) باسی گۆڕانكارییەكەی هاوسەرگیرییەكەی دەكات: من و (رۆجەر) سێ ساڵ لەمەوبەر هاوسەرگیریمان كرد. ژیانمان سەرنجڕاكێش و پڕ ئاسودەیە. بەڵام دیارە هەمیشە بەم شێوەیە نەبوە. پێش خوێندنەوەی كتێبی (پیاوان لە مەریخەوە هاتون و ژنان لە ڤینۆسەوە) بە بەردەوامی لەگەڵ یەكترییدا ناكۆك بوین. هەرگیز هەستم نەكردووە كە بەراستی گوێم لێ دەگیرێت، ئەویش هەستی دەكرد كە هەرگیز ئاسودە نابم: ئەمەش گێژاوێكی كلاسیكی مەریخی/ڤینۆسییە.

تەنیا بۆ ئەوەی لێ بكەم دابنیشێت و قسەم لەگەڵدا بكات ناڕەحەتیم لە پەیوەندییەكەماندا دروست دەكرد. هەندێك جار ئەو ئاخاوتنە تا درەنگانێكی شەو بەردەوام دەبون، تا نزیكەی دو و سێی شەو. دواجار بۆم دەركەوت من بۆ شەڕ دەگەڕام تەنیا بۆ ئەوەی ناچار ببێت وتووێژم لەگەڵدا بكات. ئەمە سەرنجە یەكپارچەكەی ئەوی دەدامێ. بەڵام ئەوەشم بەسەردا دەباری كە بیرم لێنەكردبۆوە .. توڕەییەكەی.

**تەنیا بۆ ئەوەی لێ بكەم دابنیشێت و قسەم لەگەڵدا بكات ناڕەحەتیم لە پەیوەندییەكەماندا دروست دەكرد.**

دواجار تێگەیشتم کارێکی بێسودە کە مشتومڕ لەسەر شتی لاوەکی بکەیت، چونکە وادەکات پاش تەواوبونی مشتومڕەکە ئەو زیاتر بچێتەوە ناو ئەشکەوتەکەی. بۆ من باش بو چونکە دواجار دەمتوانی دەرفەتێکم هەبێت بۆ قسەکردن، بۆ هەڵڕشتنی هەمو ئەو شتانەی لە مێشکمدا بون، بەڵام ئەم کارە ئەوی بێزار دەکرد.

(رۆجەر) بەرامبەر بە هەمو هەستەکانی من هەستی بەبەرپرسیارێتی دەکرد، بۆیە دەیویست چاکم بکاتەوە. من بە شوێن ئاشتکردنەوەیدا نەدەگەڕام؛ تەنیا دەمویست ئەو گوێم لێ بگرێت. هەتا لە بازنەی ئەم خووە کلاسیکییەی (ئاشتکردنەوە/تەنیا گوێگرتن)دا بوین، هیچ دەستکەوتێکی گرنگ و چاکمان چنگ نەکەوت.

ئەم شێوازە سێساڵی خایاند تا ئەوکاتەی من کتێبی (پیاوان لە مەریخەوە هاتون و ژنان لە ڤینۆسەوە)م خوێندەوە و لە جیاوازییەکانی نێوانمان تێگەیشتم. داوام لە (رۆجەر) کرد گوێ لە کاسێتەکە بگرێت و تەماشای ڤیدیۆکە بکات، دوای ئەوە بە شێوەیەکی جیاواز بەیەکەوە بەستراینەوە. دەستمان کرد بە قبولکردنی ئەو راستییەی کە ئێمە لە یەکتر جیاوازین.

ئێستا کە دەزانم ئەو بە شێوەیەکی کەللەرەقانە لە شێوازە مەریخییەکەیدا راوەستاوە، پەنجەی دەستم وەك نیشانەی (٧) لەپشت سەری خۆمەوە بەرز دەکەمەوە بە جۆرێك کە دیار بێت. رەنگە تۆزێك بیانجولێنم و بە گاڵتەکردنەوە بڵێم کە ئەو (مەریخییە پەسەندکراوەکەی منە.)

**بە گاڵتەکردنەوە دەڵێم کە ئەو**
**"مەریخییە پەسەندکراوەکەی منە."**

ئێمە ئێستا دەتوانین بەو مەسەلانە پێبکەنین کە جاران مشتومڕیان لێ دەکەوتەوە، پەیوەندییەکەشمان بەشێوەیەکی دراماتیکی گەشەی کردووە. ئێستا تێگەیشتوم کە مەریخی پێویستی بە بۆشایی هەیە، و ئەشکەوتەکەی قەدەغەیە بۆ ڤینۆسییەکان و هەروەها ئەوەش دەزانم کە دواجار هەر دێتەوە دەرێ. ئەویش تێدەگات کە ڤینۆسی

پێوستی بە قسە کردنە (قسە لە دوای قسە)، و خۆی وەك مەریخی‌یە پەسەندکراوەکەی من پێویستە تەنیا هەر گوێبگرێت و هەوڵنەدات چاکم بکاتەوە.

ئێمە ئەوەمان قبوڵە کە شتێکی ئاساییە لەبارەی پارە و منداڵ و سێکس و کار و پێکەوە کاتبەسەربردن و شتی دیکە بیرکردنەوەی جیاوازمان هەبێت. دیارە هەتا لە یادیشمان بێت ئەو راستی‌یە قبوڵ بکەین کە ئێمە لە یەکتری جیاوازین ئەوا دەتوانین تێبگەین کە بەرامبەرەکەمان سەرسەخت و کەللەرەق و ناکۆك نی‌یە، بەڵکو تەنیا ئەوەیە کە لە هەسارەیەکی دیکەوە هاتووە.

**دەتوانین تێبگەین کە بەرامبەرەکەمان سەرسەخت و کەللەرەق و ناکۆك نیە، بەڵکو تەنیا ئەوەیە کە لە هەسارەیەکی دیکەوە هاتووە.**



بۆ نمونە، لە کریسمسدا (رۆجەر) بۆ کڕینی دیارییەکان لەدوا خولەکدا بڕیاردەدات، بەڵام من حەزم لە بەرنامە دارشتنی پێشوەخت هەیە. ئەمە جاران بەریەککەوتنی زۆری دروست دەکرد. جاران من هەوڵمدەدا بیگۆڕم و ئەویش بەرهەڵستی دەکرد. ئێستا من رێگەی پێدەدەم مەریخی بێت و سەرسام دەبم بەوەی کە ئازاد بێت چەند زۆر شت دەکڕێت.

ئەو جاران چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکردم کە دڵخۆش بم بەرامبەر تایبەتمەندێتییە جۆراوجۆرەکانی ئوتومبیلەکەی و ستیریۆی کۆمپیتەرەکەی. ئێستا ئەوە ناهێنێتە روی خۆی. من زۆر بایەخ بەوشتانە نادەم کە ئەو بایەخیان پێدەدات. هەردوکمان دڵخۆشین کە بایەخ بە یەکتری دەدەین و چێژ لەوشتانە دەبینین کە پێکەوە دەیانکەین و هاوبەشییان پێدەکەین.

لە سەرو هەمو ئەوشتە تایبەتانەوە کە بۆ یەکتری دەکەین، لە هەموی تایبەتتر ئەوەیە کە رێگە بە یەکتری دەدەین کە خۆمان بین. بۆ نمونە، ئەو دەزانێت من پێویستم بەوەیە گەشت بکەم بۆ ئەوەی چاوم بە منداڵەگەورەکانم و کوڕەزا خۆشەویستەکەم بکەوێت. ئەو رقی لەوەیە لێی دوربکەومەوە و نیگەرانە لەوەی رەنگە شتێکم توش ببێت. لەگەڵ ئەمەشدا تێدەگات کە بۆچی دەبێت ئەو گەشتە بکەم و

گەشتەکانم قبوڵ دەکات.

منــیش دەزانم کــە ئــەو کارەکــەی خــۆیی لــەلا گرنگــە کاتێــك زۆر رۆدەچــێتەوە کارەکەیـەوە ناتوانێـت بـیر لـە مـن بکاتـەوە. هەنـدێك جـار بەمـە بێـزار دەبم و هەسـت دەکـەم بـە پلـەی دووەم دێـم. لەگـەڵ ئەمەشـدا ئـەو پابەندییـەی بـۆ کارەکـەی لـەلام خۆشەویست و پەسەندە - هەرچەندە هەنـدێك جـار شـێت دەبم پـێی. فێـری ئـەوە بـوم تێبگەم کە ئەو دواجار دەگەڕێتەوە بۆ لام. وەکو لاستیکێکی راکێشراو، دەگەڕێتەوە.

پەیوەنـدییکردن یەکێکـە لـە بـوارە هـەرە باشـەکانمان. هـەمو کەسـێك ئـەو قسـەیەی بیسـتووە کـە دەڵێـت (کـات هـەمو شـتێکە.) ئێسـتا کاتێـك دەمـەوێت لەسـەر شـتێك قسـە لەگەڵ (رۆجەر) بکـەم کاتەکـە هەڵدەبـژێرم و ئەمـەش زۆر باشـترە. زۆری پێخۆشـە کـە دەبینێت هەتا لە ئەشکەوتەکەی نەیەتە دەرێ من هیچ پرسیارێکی لێ ناکەم.

فێری ئەوە بوم کە بێئەقڵییەکی تەواوە بە (رۆجەر) بڵێم چی بکات. هەرچۆنێك بێت یاخی دەبێت. کاتێك دەمـەوێت شـتێکی لێ داوا بکـەم، لـە جیـاتی ئـەوەی ئاراسـتەی بکەم یان فرمانی پێبکەم راهێنانم لەسەر بەکارهێنانی وشەی (دەکەیت) کردووە. ئەمـە شتی سەرسوڕهێنەر لە پەیوەندییەکەماندا دروست دەکات. لـە رێگـەی داوا لێکردنییـەوە کـە یارمـەتیم بـدات، بـە بـەکارهێنانی (ئایـا... لەبـەر چـاو دەگریـت؟) یـاخود (تکایـە... دەکەیت؟) زیاتر بە (بەڵێ) وەڵامم دەداتەوە.

بــۆم دەرکــەوتووە کاتێــك ســەرگەرمی چــالاکیە پەســەندکراوەکانێتی وەك تەماشـاکردنی وەرزش لەسـەر تەلـەفزیۆن و کـارکردن لـە گەراجەکـە و ئەنجامـدانی ژمێریاری لەسەر دەفتەری چەك و پسوڵەکان، و لێخوڕینی کەشتییە ئاسمانییەکەی بـە دەوری هەسـارەکەدا، مانـای وایـە لـە ئەشـکەوتەکەیدایە. بـۆم دەرکـەوتووە کـە سـەرکەوتوترین شـت لـەم کاتانـەدا ئەوەیـە داوای لێ نەکـەم قسـەم لەگەڵدا بکات بـەڵکو چاوەڕێی ناوبڕێك، پشویەك لـە کارەکەیـدا، یـاخود ئاماژەیـەکی راوەسـتان بکـەم. پاشـان بۆچونی لێ وەردەگرم یاخود سەری قسەیەك دادەمەزرێنم.

کە من و (رۆجەر) هاوسەرگیریمان کرد، وام دەزانی دەبێت بـە (هـەمو شـتێك) بـۆ مـن. بـەڵام ئێسـتا تێگەیشـتوم کـە ئـەوە ئـەرکی هاوبەشـی هاوسـەرگیرییەکەم نییـە ببێتـە تاکـە دابینکەری (هەمو شتێك)ی ژیانم. بـە دیهێنـانی پێویسـتییەکانم ئـەرکی سەرشـانی خۆمـە،

وەك چۆن ئـەرکی سەرشـانی ئـەوە کـە پێویسـتییەکانی خـۆی بـەدیبهێنێـت. لـە ڕێگـەی تێگەیشـتنەوە لـە جیاوازییـە سروشـتی و بۆماوەییەکانمانـەوە، زۆر ئاشـکرا دەبێـت کـە چاوەڕوانیکردنی ئەوەی (ڕۆجەر)ەکەم ببێتە هەمو شتێك بۆ مـن بیرۆکەیـەکی بێئەقڵانـە بو. ئای چ گوشارێکی دەکەوێتە ئەستۆ کە چاوەڕوانی لێبکەم هەمو شتەکان دابین بکات!

**ئەوە ئەرکی هاوبەشی هاوسەرگیرییەکەم نییە**
**ببێتە تاکە دابینکەری (هەمو شتێک)ی ژیانم.**

ژیان لەگەڵ کەسێکدا کە لە هەسارەیەکی دیکەوە هاتبێت زەحمـەتێکی بەردەوامـە. هـەر ڕۆژە و لەگـەڵ خۆیـدا کێشـە و سـەختی نـوێ دەهێنێتـە سـەر ڕێگاکـانی پەیوەنـدییمان. هـەبونی ڕۆحـی گاڵتـە و گـەپ، بـیرەوەری تیـژ سـەبارەت بـە جیاوازییـەکانمان، و پابەنـدبونمان بـەوەی کـە ژیـان زۆر بـە جـدی وەرنـەگرین کلیلـی هاوسەرگیرییە تەندروست و دڵخۆشەکەمانن.

هاوسەرە مەزنەکەم بەشدارییەکی هەیـە لـە دروسـتکردنی چیرۆکەکەدا، و بـە شـێوە مەریخییە ڕاستەقینەکە کورت و ڕاستەوخۆ ئەمەیە: (ڕۆجـەر) دەڵێـت "گـرنگترین شـت بۆئەوەی لەیادمان بێت ئەوەیە کە ئێمە لە یەکتر جیاوازین."

## مانەوە پێکەوە

(ئادریان) چیرۆکی خۆشەویستییەکەی گێڕایەوە: کە بیر لەوە دەکەمـەوە مـن و (شـین) لـە نزیکـەی بیسـت سـاڵی هاوسـەرگیرییەکەماندا بـە چیدا تێپـەڕیوین، دڵنیـام زۆرێـك لـە کەپڵەکانی دیکە بەردەوامییان بەوجۆرە پەیوەندییە نەدەدا. دایك و بـاوکی (شـین) مـاوەی چل و پێنـچ ساڵ لەگەڵ یەکتر بون، بەڵام دایك و باوکی من کاتێـك تەمـەنم یـانزە سـاڵ بـو لـە یـەکتری جیـا بونـەوە. ئەمـەش وایکـرد بـەپێی بنـەمای مێـژوی خێزانـی، دەرفـەتی سەرکەوتنی درێژخایەن پەنجا لە سەد بێت. کەواتە چی ئێمەی بە یەکترەوە هێشتەوە؟

با کورتەیەکی مێژوییتان بدەمێ. من و (شین) لە کۆلیج یەکترمان ناسـی کاتێـك مـن هەژدە ساڵ بوم و (شـین) بیسـت سـاڵ بـو. مـن بـواری پـەروەردەی تایبـەتم دەخوێنـد و ئـەویش شـانۆی دەخوێنـد و بڕوانامەیـەکی لاوەکیشـی لـە پەیوەنـدی گشـتیدا بـە دەسـت

دەهێنـا. ئێمـە لـە شـانۆی کۆلێجـدا یـەکتریمان بینـی، چـونکە منـیش حـەزم لـە کـاری ئەکتەری هەبو، ئیتر بوین بە هاوڕێ.

بـڕوام وایـە کـە ئەمـە یەکـەم کلیلـی سـەرکەوتنە رۆمـانسـیەکـەمان بوبێـت: ئێمـە یەکەمجار هاوڕێ بـوین پـێش ئـەوەی یـەکتریمان خـۆش بوێـت. مـن متمانـەم بـە (شـین) هەبو ئەویش بە من. من لەگەڵ هەمو هاورێکانیدا ژوانم بەست ئینجا بۆم دەرکەوت کە (شین) چاوەڕێی سەرنجی منە.

پێش ئەوەی کە (شین)م خۆش بوێت، بڕیارمدابو کە واز لـە پیـاوان بهێـنم. هەسـتم دەکـرد پیـاوان متمانـەیان پێناکرێـت و تـەنیا سێکسـیان دەوێـت. ئـەو بیروبۆچـوونە رۆمانسیانەی کە لە گەنجێتیدا هەمبون بـەهۆی ئەزمونـە خراپەکانـەوە تێکچوبون. مـن تەمەنم نۆزدە ساڵ بو کاتێك (شین) بە ئاشکرا ماچی کـردم، لـە گۆشـەیەکی قـەرەباڵغی لای بەشە ناوخۆییەکەوە. بـۆم دەرکـەوت کـە خۆشـم دەوێـت و ئەمـەش جـۆرە شـتێکی چاوەڕواننەکراوبو.

لە دوای ئەو ماچە، هیـچ پەلـەی نـەکرد لەگەڵمـدا بخـەوێت، و ئەمـەش وای لێ کـردم زیـاترم خۆشـبوێت. لەڕاسـتیدا، ئـەوە مـن بـوم کـە پـاش ماوەیـەکی بەرچـاو لـە پەیوەندییەکـەمان ئێوارەیـەکیان بانگێشـتم کـرد بمێنێتـەوە. وەکـو خۆشەویسـت، ئـەو کەسێکی هەستیاربو، رۆمانسی و زۆر سێکسی بو. کاتێك مـن بیست ساڵ بـوم و ئـەویش بیستودوو بو هاوسەرگیرییمان کرد.

**لە دوای ئەو ماچە، هیچ پەلەی نەکرد لەگەڵمدا**
**بخەوێت، و ئەمەش وای لێ کردم زیاترم خۆشبوێت.**

ئێستا (شین) چل و دو ساڵە من چل ساڵم. منداڵەکانمان خەریکە گەورە دەبـن. مـن مامۆستای (مۆنتیسۆری)م و (شین) بەرێوبەری هۆڵێکی شانۆیە، بەڕێوبـەری بەرهەمـە و نوسـەرێکی سـەربەخۆیە. خۆشەویسـتییەکەمان بـە درێـژایی ئـەم سـاڵانە قـوڵتر و دەوڵەمەندتر بووە. سەختییەکانی رێگامان بەهێزتریان کردوین.

ئـەو ماوەیـەی کـە (شـین) بـەهۆی پیشـەکەیەوە زۆرجـار شـەوانە لـێم دور دەکەونـەوە، ئەگەر متمانەیەکی بەهێزمان بـە یـەکتری نەبوایـە نەمانـدەتوانی درێـژە بـە پەیوەندییـەکان بدەین. من ئەوکاتـە لەگـەڵ هـاوڕێ کچەکانمدا دەچومە دەرەوە بـۆ ئـەوەی لـە ماڵـەوە تـەنیا نەبم. لە حاڵەتەکەی ئێمەدا، دووری وای‌کـرد دڵمـان خۆشەویستی زیـاتر دروسـت بکات، وەك لە ماوەی پێکەوە ژیانمان، ژیانی دور لە یەکتریشمان بەسـەربردووە. ئەگـەر ئێمـە بـە کـاتێکی سـەختدا تێبپەڕینایـە، پابەنـدی هاوسـەرگیرییەکەمان دەماینـەوە. کاتێـك کێشـەمان لەگـەڵ کوڕەکەماندا هاتەڕێ سـەردانی چارەسـەرکارمان کـرد، کتێبـی خۆیارمەتیـدەرمان خوێنـدەوە، قسەمان لەگەڵ هاوڕێکانمان کرد، ئەرکەکانی هەریەکەمان دیـاری کـرد، و کاتمـان تـەرخانکرد بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان. گاڵتەکردن پێکهێنەرێکی گرنگ بو لە دەربازبونمـان بـە ناوچـە سەختەکاندا، هەروەها پشودرێژی و کۆڵنەدانمان لە هەوڵدانـدا کاریگەرییەکی بەهێزیان هەبو.

ئێمە ئەمڕۆ تەماشای خۆمان دەکەین و بۆمان دەردەکـەوێت لـە سـەردەمی گـەنجێتی زیاتر یەکتریمان خۆش دەوێت. ژیانی سێکسیمان چۆتە قۆنـاغێکی نـوێ و دڵخۆشـکەرەوە چونکە زۆر بە باشی یەکتری دەناسین. لەگەڵ ئەمەشدا، هێشتا کەمێك تەمومـژ هەیـە و دەزانین هەرچەندە پێمان وابێت کەسێك بە باشی دەناسی، هێشتا ئـەو کەسـە دەتوانێـت غافڵگیر و سەرسامامان بکات.



## من خاڵ بۆ شتە بچوکـەکانیش دادەنێم

(شین) ئـەو شـتە بچوکانە دەزانیـت کـە خاڵـەکانی لەگـەڵ منـدا پـێ هاوتـا بکاتـەوە. ئێمە پێکەوە رۆژنامە دەخوێنینەوە و باس لەوشتانە دەکـەین کـە لـە جیهانـدا رودەدەن. کاتێك هەڵبژاردن دێتەوە پێشەوە، ئێمە باسی بۆچونەکانمان لەسـەر بابەتـەکان دەکـەین و زۆر جار پێکەوە دەچین بۆ دەنگدان. (شین) چـیرۆك و هـۆنراوەم بـە دەنگـی بـەرز بـۆ دەخوێنێتەوە و من زۆرم حەز لێیە. دەچین بۆ پیاسەکردن، پشتی یەکتر دەخـورێنین، و قاچی یەکتر دەشێلین. ئێمە پێکەوە چێژ لە هونەر وەردەگرین، لە شانۆ، مۆسـیقا، فـیلم، مۆزەخانە، شاخەوانی، و چادرگە. هەرچەندە بە ئارەزووی دڵی خۆمـان گەشـتوگوزارمان

نەکردووە، بەڵام کاتێك گەشت دەکەین، ئێمە پێکەوە فێری شوێنەکە دەبین و زۆر جار (شین) زانیاری دەربارەی ئەو شوێنانەم بۆ دەخوێنێتەوە کە بۆیان دەچین.

ئێمە هەمیشە لە بواری کارەکانماندا پشتگیری یەکترمان کردووە. کاتێك (شین) بۆچوونی منی دەوێت، گوێ لەو ریکلامانە دەگرم کە نوسیونی. زۆربەی زۆری ئەو بەرنامانەم بینیوە کە ئەو بەشداری تێدا کردون. ئەویش هەمیشە بەشداری ئەو بەرنامە بچوکانە دەکات کە خوێندکارەکانم دەیگێڕن. هەندێك جار ئەو بەشێکە لە بەرنامەکە، بۆ نمونە جارێکیان وەك بەرنامەیەکی تایبەت لە کاتی پشووەکاندا ئەو چیرۆکەکەی دەخوێندەوە و من و کچەکەم شانۆیەکی سێبەری بوکەڵەمان پێشکەش دەکرد.

ئەگەر داوای لێبکەم، بڵاوکراوەکانی پۆلەکەم دەخوێنێتەوە و چاکیان دەکات. دوای چالاکییە گەورەکان یارمەتیم دەدات پۆلەکە پاك بکەمەوە و لە هەڵمەتی کۆکۆدنەوەی کۆمەکی دارایی بۆ خوێندنگاکەمان بە چالاکی بەشداری کردووە.

ئێمە فێری ئەوە بووین کە باشترین کات بۆ پەیوەندییکردن ئەو کاتەیە کە هەردووکمان پشوویەکی باشمان داوە نەك ئەو ساتەی کە لە دوای کارکردنەوە دەگەڕێنەوە یاخود ئەو کاتەی لەژێر گوشاری تەواوکردنی کارێکداین یاخود نەخۆشین. ئێمە ئەو بۆشایییە بە یەکتر دەدەین کە بۆ ئەنجامدانی کارەکان پێویستمانە. فێری ئەوە بوم کە بواری بدەمێ بچێتە ئەشکەوتەکەی و (کاتی ئەشکەوت) بە (شین) ببەخشم.

ئێمە لە داواکردنی پێویستییەکانماندا بەرەوپێش چوین و بە شێوەیەکی روون و بێخوکمدان ئەم کارە دەکەین. کەمێك کاتی ویست لەبری ئەوەی توانیم بڵێم (فلانە کار دەکەین) پێی بڵێم (دەتوانیت فلانە کار بکەیت؟). ئەمە شتێکی بچوکە، بەڵام ئەو بەڕاستی دەینرخێنێت.

لەوکاتانەدا ئیش‌وکار وامان لێ دەکەن زۆر بە کەمی یەکتر ببینین، ئێمە نامە بۆ یەکتر دەنوسین. بەم شێوەیە، زۆر بێئاگا نابین لەوەی کە هەریەکەمان و منداڵەکان خەریکی چین.

لەگەڵ هەر سەختییەکدا کە ژیان دەیهێنێتە پێشەوە ئێمە بەردەوام پێکەوە شت فێر دەبین. ئێمە پاش ماوەیەکی دیکە دەبین بەو کەپڵەی منداڵی لە ماڵەوە نامێنێت.

کچەکەمان خوێنـدکاری دوا قۆنـاغی ئامـادەیـی‌یـە و سـاڵێکی دیکە دەچێتە کۆلێج، ئـەم ساڵەمان زۆر لـەلا بەنرخـە. لەهـەمان کاتـدا، مـن و (شـین) توشـی بێکـاری و هـەمو ئـەو هـەوراز و نشـێوانە بـوین کـە لەگـەڵ بێکاریـدا دێنـە پێشـەوە. مـن وا هەسـت دەکـەم کـە بەمەشدا تێدەپەڕین. ئێمە بناغەیەکی بەهێزمان هەیە.

## زانینی ئەو شتەی دەتەوێت

(میتزی) ئەمەی گێڕایەوە: لە تەمەنی سی و شەش ساڵیدا، گەیشتمە ئەو خاڵەی کـە ئەگـەر لـە پەیوەندییـەکی باشـدا نـەبم باشـتر وایـە بەتـەنیا بم. مـن پێشـتر چـەند پەیوەندییەکی درێژخایەن و چەند پەیوەندییەکی کورتخایەنم هەبووە، بەڵام ئـەو کاتـە بـە باشـی دەمتـوانی بڵێم ئایـا هـیچ ئاینـدەیـەکم لەگـەڵ کەسـێکدا دەبێـت یـان نـا. مـن بەراستی ڕێزم لەو لەخۆوەزانینەم دەگرت و پێوەرێکی بەهێزم هەبو بـۆ چۆنایەتی ئـەو پەیوەندییەی پەسەندم دەکرد.

چـۆنایەتییەکان بریتـی بـون لـە متمانـە، ڕێـز، هاوڕێیـەتی، گـەرم و گـوڕیی، و خۆشەویستی. من پێوەریشم هەبو بۆ ئـەو کەسـەی دەمویست پەیوەنـدی لەگەڵدا دروست بکـەم: کەسـێکی پێگەیشـتو، زیـرەك، دڵسـۆز، کۆڵنـەدەر، کـراوە بـۆ گەشـەی بـەردەوام و بیرۆکەی نوێ، کەسێکی تەندروست، پڕ وزە، و قۆشمە، کەسێك بتوانم چێژی لێ وەربگرم.

من ئەو کاتە هەستێکی زۆر باشم هەبو بەرامبەر ژیانم، و هـەر کەسـێك بهاتایـە نـاو ژیانمەوە دەبو باشتری بکات - دەبو هەریەکـەمان ژیـانی ئـەوی دیکـەمان باشـتر بکردایـە. ئەمـە کـاتیکی تایبـەت بـو بـۆ مـن. مـن دوو بەشـی خـۆمم پێکـەوە دەبەسـت: بەشـە سۆزدارییەکەم و بەشە ئەقڵییەکەم. دەمتوانی تەماشای ئاستە جیاوازەکانی خـۆم بکـەم و بیر لەو هاوبەشە بکەمەوە کـە بتوانێت تـەواوم بکات. کەسـێك بمانتوانیایـە لەگەڵیـدا پێکەوە ژیانێکی سەرنجڕاکێش دروست بکەین.

**من ئەو کاتە هەستێکی زۆر باشم هەبو بەرامبەر ژیانم، و هەر کەسێک بهاتایە ناو ژیانمەوە دەبو باشتری بکات.**

لەو سەردەمە باشەدا، لەگەڵ هاوڕێیەکی نزیکی ژنـدا چوم بـۆ پێشانگایەکی هونـەری و لەوێ (فرانك)م بینی. هات بۆ لامان و دۆستانە قسەی لەگەڵدا کردین. لـە بیرمـە دوای چـەند خولەکێك بیرم کردەوە کـە (فرانـك) کەسێکی زۆر تێگەیشتووە، زیرەکە و بـە باشـی بیر لـە شتەکان دەکاتەوە. لە هەمان ساتدا، هاوڕێکەم بـە دڵخۆشـیـەوە چرپاندی بـە گوێچکەمدا و گوتی (ئەمـە پیاوێکی کامڵە بـۆ تـۆ، (میتـزی). کـە هـات بـۆ لامـان وێنـەی هـەردوکتانم لـەلا دروست بو.) بەڵام من سەرسام بوم و لە قسە کردن لەگەڵ (فرانك) بەردەوام بوم.

کـەمێك قسـەمان کـرد و پاشـان هەریەکـەمان چـو بـەلای کـاری خۆیـەوە، بـەڵام لـە دەرەوە لەسەر شەقامەکە دووبارە یـەکتریمان بینییـەوە و پـێم گـوت لەگـەڵ هاوڕێکانمـدا دەچـین گـوێ لـە مۆسـیقای جـاز بگـرین. لـەوێ یـەکمان بینـی و دوای بەرنامەکـە گـوتی (دەزانیت، ئەمشەو مانگە شەوە. حەز دەکەیت پیاسەیەك بکەین بۆ سەر کـەنار دەریـا؟) سەرسام بوم بەوەی کە زانی ئەو شەوە مانگە شەوە.

بەم جۆرە لەسەر کەناری دەریا پیاسەمان کرد - و پاشان، کاتێك ڕۆیشت نـاوی خـۆی و ژمـارەی تەلەفۆنەکـەی دامـێ. وتـی (ئەگـەر حـەزت کـرد یـەك ببینینـەوە، تکایـە پەیوەندیم پێوە بکە.) من هـەرگیز شـتی وام نـەکردبو. وا دەزانم (فرانـك) گـرنگ نـەبو لەگەڵ کەسدا بچێتە دەرەوە مەگەر ئەو کەسە بەراسـتی سـەرنجی ڕاکێشابێت. بەراسـتی کەوتبۆوە سەر من ئایا پەیوەندی پێوە بکەم یان نا - لـە پـڕ هەسـتم بـە بەرپرسـیارێتی کرد، وەك ئەوەی پەیوەندییەکە لە دەست مندا بێت، ئـەی ئەگـەر بـاش نـەبو؟ شـتێکی سەرسامکەر دەبو ئەو لایەنەی بارودۆخەکەش ببینین.

بەڵام بەلای منـەوە وا دیـار بـو (فرانـك) کەسێکی ڕاسـتەقینەیە، و منـیش کەسێکی ڕاسـتەقینەم لـە ژیانمـدا دەویسـت. بڕیـارم دا تـاقـیبکەمـەوە و تەلـەفونم بـۆ کـرد. بەرنامـەمان بـۆ یـەکتر بیـنین داڕشت، و لەوکاتـەوە بەیەکـەوەین، ئێستا زیـاد لـە پێـنج ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە.

من نەمدەزانی (فرانك) بەشـداری وۆرکشـۆپەکانی (جـۆن گـرەی) کـردوە و بەراسـتی چێژی لێبینیبو. ئێمە بیستمان (جۆن) دێت بۆ (هاوای) و (فرانك) زانی کە من هـەم لـە ڕوی کارەکەمـەوە کـە ڕاوێـژکارم و هـەم لـەڕوی کەسـێتییەوە چـێژ لـە وۆرکشـۆپەکە

دەبیــنم. ئێمــە پێکــەوە چــوین، و وا هەســت دەکــەم لەوکاتــەوە یارمــەتی هــەمو کەسێکمانداوە. لە یەکەم وانەدا جۆرە مشتومڕێکمان بۆ دروست بـو و نـەمانتوانی لێی دەرباز ببین. وتم با یەك شتی دیکە تاقیبکەینـەوە، کـە تـەکنیکێکی (جۆن گرەی) بـو. شـێوازەکەمان لـە قسـە کردنـەوە گـۆڕی بـۆ بـاوەش بەیەکـدا کـردن. لـە مـاوەی چـەند خولەکێکدا ئەو ئازار و توڕەییەمان ڕەواندەوە و چوینە ئەو شـوێنەی کـە دەتـوانین ڕێـز لە بۆچونەکانی یەکتر بگرین. پاشان کەمێك خەوتین.

---

**لە ماوەی چەند خولەکێکدا ئەو ئازار و توڕەییەمان ڕەواندەوە.**

---

ئەوەی ئەو ساڵە لەبارەی پەیوەندییەکەمانەوە جێی سەرنج بو ئـەوەبو ئێمـە سـڕبوین و چـاکبوینەوە - مـن تـەنیا بـەوەی لەگەڵیـدا بـوم هەسـتم بـە چارەسـەرێکی گـەورە دەکـرد، هەروەها ئەوەش کە لە ماڵەوە بوم یارمەتیدەر بو. لەبارەی دۆزینـەوەی کەسـێکی راستەقینە مـن بـرین و تـرس و پرسـیاری خـۆمم هـەبو، بۆیـە کاتێـك ئـەو سـاڵەی یەکـەممان پێکـەوە بەسـەربرد، پشـوماندا، سـروت و یـاری پچـوکمان پێکـەوە ئـەنجام دەدا، گوێمـان لـە مۆسـیقا دەگرت، و زۆر شتی کۆن ڕەوینەوە. دوای ئـەوە دەسـتمان کـردەوە بـە بینینـی هاوڕێکانمـان، و هەر بازنەیەك ڕێزی لەوی دیکە دەگرت، و ئەمەش بەلای منەوە نیشانەیەکی مەزن بو.

ئەوەی خۆشحاڵم دەکات ئەوەیە کە پەرەسەندنێکی سروشتی لـە پەیوەندییەکەمانـدا هەیە. ئێمە بە خێراییيە تایبەتەکەی خۆمـان بـەرەو پابەنـدی زیـاتر، گـەرم و گـوڕی و خۆشەویستی زیاتر و ئاستێکی وزەی بەردەوامی ئـەوتۆ چـوین کـە زیاتروزیـاتر هەسـتی پێدەکەم. من بڕوایەکی ئەرێنیم بە داهاتومان هەیە. من زۆر متمانەم بە (فرانك)ە.

لە پەیوەندییەکانی پێشوتردا، ڕەنگـە مـن متمانـەم بـەوە نـەکردبێ کەسـەکە بتوانێـت ژیانی خۆی بەڕێوەبەرێت و ناچار پێویستە من ببم بە چارەسەرکار و مامۆسـتا و دایـك، و هەرچییەکی دیکە. بەڵام من متمانەی زۆرم بـە لێهاتویی (فرانـك)، و بـە تواناکـانی هەیـە لە مامەڵە کردن لەگەڵ هەمو ئەو شتانەدا کە رودەدەن، متمانەم بەوەشە کـە ئـەو باشـترین ڕێگە هەڵدەبـژێرێت. فێـر بـوم کـە خۆشویسـتنی پیـاو ئەوەیـە متمانـەت پێبێـت و قبـوڵی بکەیت. بەهۆی فێربونی متمانەپێکردن و ڕێگەپێـدان بـەوەی کـە (خـۆی) بێـت، توانیومـە

قبولکردنێکی قوڵتر بە دەست بهێنم. من دەزانم کە ئەوە زۆر بە هەند وەردەگرێت.

شتێکی نایابە کە بتوانیت خۆت بیت و بەو شێوەیە پەیوەندی لەگەڵ خەڵکدا بکەیت. لە کۆتاییدا شتێکی مەزن دەبێت ئەگەر هەمو کەسێك بتوانێت بەو شێوەیە هەست بکات، بەڵام هەمیشە فلاَنە شت و فیسارە مەسەلە رێگە لە خەڵك دەگرن کە بەراستی خۆیان دەربخەن و بۆ کەسانی دیکەی ئاشکرا بکەن. ئەوە شتێکی سەرنجڕاکێشە بتوانیت وەکو (خۆت) بێیتە پێشەوە و بزانیت کە باشیت و قبوڵ دەکرێیت.

سەرەڕای قبولکردنێکی زیاتر لە جاران، لە رێگەی راهێنانەوە لە سیمینارەکانی (جۆن)دا زمانێك و چوارچێوەیەکی هاوبەشمان بەدەست هێنا کە بەهۆیەوە دەتوانین بیر لە پەیوەندییەکەمان بکەینەوە و بزانین کارێکی سەخت و چەواشەکارو ئەبستراکت نییە. شتێکی زۆر ئاسانە کە بۆ تێگەیشتن و ئەو زانیارییانەی کە فێریان بوین دەتوانرێت دەستبەجێ بەکاربهێنرێن و سودیان لێوەربگیرێت.



**زمانێک و چوارچێوەیەکی هاوبەشمان بەدەست هێنا**
**کە بەهۆیەوە دەتوانین بیر لە پەیوەندییەکەمان بکەینەوە و**
**بزانین کارێکی سەخت و چەواشەکارو ئەبستراکت نییە.**

ئاوڕم داوەتەوە بۆ پەیوەندییەکانی جارانم کاتێك بەراستی دەستم کرد بە بیر کردنەوە لەوەی (پیاوان چییان دەوێت) ئاوڕم دایەوە بۆ پەیوەندییەکانی جارانم و توانیم ئەوە ببینم کە تەنانەت بەوپەڕی نیازچاکیشەوە، من هەندێك زیانم بەو پەیوەندییانە گەیاندووە. لە رێگەی (جۆن گرەی)ەوە رونترم بۆم دەرکەوت پیاوان و ژنان چییان دەوێت و ئەوان لە پەیوەندییەکدا چییان بەلاوە گرنگە. بڕوا بکەن، من ئەم زانیارییەم لەگەڵ کارەکەم دا و هەروەها لەگەڵ ژیانی تایبەتیمدا پێکەوە بەستۆتەوە. دروستکردنی شتێکی سەرکەوتو، ئەنجامدانی ئەو شتانەی کە لە پەیوەندییدا سەرکەوتو دەبن — ئەمانە ئەو شتانەن کە کردومانن.

ئەوەی کە لە نێوان من و (فرانك)دا رویدا جوڵەیەکی سروشتی تێدابو، من هەستم بە پێویستی بۆ جوڵاندن و بەکارهێنانی شتەکان نەدەکرد. من متمانەم هەبو شتە

ڕاستەکان لە کاتە گونجاوەکاندا ڕودەدەن. واش دەرچو.

## زاڵبون بەسەر ترس و پابەندبوندا

(فرانك) لە گۆشە نیگای خۆیەوە چیرۆکەکەی گێڕایەوە: من کاتێك تەمەنم بیست و یەك ساڵ بو هاوسەرگیریم کرد؛ خانمەکە حەڤدە ساڵ بو. ئەو لە (ئوستڕالیا)وە هاتبو، بەشێك لە بەرنامەکانی ئەوە بو هاوسەرگیری بکات و لە ئەمەریکا بمێنێتەوە. هەستم کرد هان دەدرێم ئەو هاوسەرگیرییە بکەم: هەستم نەدەکرد کارێکی ڕاستە، نەمدەویست ئەنجامی بدەم، بەڵام ئەوەندە متمانەم بە خۆم نەبو کە ڕێگەکەی خۆم بسەپێنم. هاوسەرگیرییەکە کارەساتێکی ڕاستەقینە بو. کاتێك کچەکەمان تەمەنی سێ هەفتە بو، بۆم دەرکەوت کە هاوسەرەکەم پەیوەندی لەگەڵ باشترین هاوڕێمدا هەیە. ئەوە تاقیکردنەوەیەکی هێندە سەخت بو کە نەدەتوانرا هاوسەرگیرییەکە بگێڕدرێتەوە.

دوای ئەوە من بڕیارم دا کە هەرگیز بە زۆر هاوسەرگیری نەکەم، هەرگیز.

**بڕیارم دا کە هەرگیز بە زۆر هاوسەرگیری نەکەم، هەرگیز.**

بە درێژایی ساڵانی بیست ساڵی و سی ساڵیم ژیانێکی جیاوازی خۆشەویستیم هەبو - هەندێك جار تەنیا بوم، پاشان ژوانم لەگەڵ ژنە زۆر سەرنجڕاکێشەکاندا دەبەست، پاشان کەوتمە خۆشەویستییەوە. لە ناوەڕاستی سییەکانی تەمەنمدا، من لەگەڵ کچێکی فڕەنسیدا دەژیام کە هەمو زانیارییەکی هەبو چۆن سێکس بکات، بە مۆم و بۆن و مۆسیقایەکی خۆشی (باخ)ەوە. ئەوە زۆر خۆش بو، ئەو کەسێکی زۆر خۆش بو. و پاشان شەوێکیان لەسەر نانخواردن پرسیاری لێ کردم (ناتوانین هاوسەرگیری بکەین؟) وشك بوم. شتێکی ماقوڵ دیاربو، ئەو ژنێکی زۆر سەرنجڕاکێش بو، بەڵام من پەیمانەکەمم بیر کەوتەوە کە هەرگیز بە زۆر هاوسەرگیری نەکەم. ئەوەش کۆتایی پەیوەندییەکی مەزن بو.

نزیکەی ساڵێك دوای ئەوە، پاش ماوەیەك ژوانبەستن لەگەڵ کەسانی جیاواز، کچێکم بینی زۆر سەرنجی ڕاکێشام. ماوەیەك بە یەکەوە ژیاین و ئەوەش شتێکی باش بو، پەیوەندییەکی تۆکمە بو. یارمەتیداوم کچەکەم گەورە بکەم. پاشان، لە پشویەکی

رۆمانسیدا بۆ (سان فرانسیسکۆ) ئەو هەمان داوای لێکردم. دەبوو هاوسەرگیری بکەین ئەگەینا دەڕۆیشت. وەکو شتێکی کاتژمێری بایۆلۆجی وابو. ئەمە زۆر بە ئازاربو چونکە خۆشم دەویست و خێزانەکەیم خۆش دەویست. بەلام دەبو پابەندبم بە بڕوا ناوەندییەکەمەوە. جیابوینەوە.

بۆ ماوەیەك بڕیارمدا، ئازاد بژیم. دەمزانی من نامەوێت هاوسەرگیری بکەم- رەنگە لەبەرئەوەی ئارەزوم لە ژنی دیکە دەکرد — بەلام نەشم دەویست بێوەفابم. بۆیە بڕیارمدا ساڵ و نیوێك پشو لە کارەکەم وەربگرم و چێژ لە ژیان وەرگرم. ئەو کارەم کرد — چێژم زۆر لەکاتەکە وەرگرت، ئەوە خۆشترین کاتم بو لەگەڵ هاوڕێکانمدا. لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر ژنی زۆر جواندا پەیوەندییم دروستکرد.

بڕوا دەکەیت؟ ئەمە بە ئازار کۆتایی هات. من هاوڕێ کچێکی جوانی گەنجی ئەڵمانیم هەبو — رۆژێکیان پێی گوتم کە بەراستی لەگەڵ هاوڕێ هەرە باشەکەمدا لە خۆشەویستیدایە. ئەمە وەکو وێنەی ناو ئاوێنە بو، وەك دانگدانەوە بو بۆ هاوسەرگیرییەکەی یەکەمجارم. نەمدەزانی چی بکەم. هەمو تیۆرییەکانم هەڵوەشانەوە.

پاش ماوەیەکی کەم چوم بۆ پێشانگایەکی هونەری و لەوێ (میتزی)م بینی. دۆستانە تۆزێك قسەمان کرد و دوای کەمێك بڕیارماندا بچین کوپێك قاوە بخۆینەوە. چوین بۆ شوێنێکی (ئێسپرێسۆ) کە لەوێ ئەو هاوڕێکانی دەبینی. بیرم کردەوە کە ئەم کەسێکی گەرموگوڕ و ئێسك سوك و باشە.

لەو شوێنی (ئێسپرێسۆ)یە، (میتزی) چەند وێنەیەکی خۆی دەرهێنا کە لە (هالۆین) دا گیرا بون. لە کردنەوەی پێشانگاکەدا (میتزی) جلێکی درێژی لەبەردا بو، بەلام لە وێنەکاندا (بیکینی) لەبەردا بو. بینیم کە جەستەیەکی نایابی هەیە، و لە پڕ هەستم بە پاڵنەرێکی گەورە کرد کە بەرەو ئەوی دەبردم. ئەو مەبەستی ئەوە نەبو، من وا نازانم، بەلام من وابوم، واو! ئەمە کەسێکی زۆر سەرنجڕاکێشە. رقم لەوەیە ددانی پێدابنێم، بەلام ئەمە بو بە یەکەم گیرۆدەبونم.

چوینە خوارەوە بۆ کەنار دەریاکە و کەمێك ماچی یەکترمان کرد و من ژمارە تەلەفۆنەکەی خۆمم دایە. وتم (ئەگەر ویستت یەکتر ببینینەوە، تەلەفۆنێکم بۆ بکە.)

کارەکەم خستە ئەستۆی ئەو. لە ماوەی یەك دوو رۆژدا پەیوەندی پێوە کردم و بۆم دەرکەوت کە بە هەمو شێوەیەك زۆر سەرنجی راکێشاوم. سەیرکە، من بەرەو چل ساڵی دەچوم، بۆم دەرکەوتبو رۆژێك دێت دەمرم، و نەمدەویست پیاوێکی رەبەن بم کە بەردەوام بە شوێن سێکسەوەیە.

**بۆم دەرکەوتبو رۆژێک دێت دەمرم، و نەمدەویست پیاوێکی رەبەن بم کە بەردەوام بە شوێن سێکسەوەیە.**



(میتزی) شتەکانی ئاسان کرد. ماڵێکی زۆر خۆشی هەبو، لە هیچ رویەکەوە زۆر جوان نەبو، بەڵام وای لێ کردبو زۆر ئاسودە بێت و هەمو ئەو شتانەی حەزی لێیان بو بە دیوارەکانەوە هەڵیواسیبون. بایەخی بە خواردنە تەندروستەکان دەدا، وەکو من. دەیزانی چۆن شتەکان جوان بکات. پێم خۆش بو لە کانە خوێیەکان کە کاری بەڵێندەرایەتیەکەم بو، بۆ ناو مۆمە داگیرساوەکانی هەمو ماڵەکە و مۆسیقا قورسەکە و بۆ لای ئەو کەسەی کە هەمو شتەکانی منی بە دڵ بو. ئۆه، ئەویش چیرۆکی خۆی هەبو بۆ گێڕانەوە. هەروەها بڕوای رۆحیی راستەقینەشی هەبو، کە رێزی لێ دەگرتن. مەبەستم ئەوە بو کە پەیوەندییەکەمان دەیتوانی زیاتر گەشە بکات لەوەی تەنیا بریتی بێت لەوەی بپرسین (چی لێ دەنێیت؟ ئەمساڵ چەند پارە پەیدا دەکەیت؟) گەشە کردنی رۆحی — ئەوە یەکێك بو لە بەرنامە شاراوەکانم لە گەڕان بەدوای پەیوەندییدا.

من پێم خۆش بو کە (میتزی) لە کارێکدا بو کە یارمەتی خەڵکی دەدا. ئەو هەمیشە یارمەتی خەڵکی دەدا و ئەوانیش بەردەوام پەیوەندییان پێوە دەکرد. هەرچەندە ئەوە زۆر نائاسایی بو، بەڵام بەراستی ئەو هیچ ئارەزویەکی لە منداڵ نەبو. ئەو منداڵی خۆش دەویست، یاری لەگەڵ دەکردن، بەڵام لەوە نەدەچو خۆی حەز بکات منداڵی هەبێت. منیش زۆر حەزم نەدەکرد، چونکە من خۆم منداڵێکم هەبو کە لێی نزیکم و زۆرم خۆش دەوێت.

بە تایبەتی دوای ئەوەی ئاشنام کرد بە سیمینارەکان، ئێمە بە بەردەوامی

تەکنیکەکانی (جۆن گرەی)مان بەکارهێناوە بۆ ئاسانکردنی شتەکان بۆ ئەوەی کێشەیان لێ دروست نەبێت و نەتەقنەوە. ئەمە زۆر یارمەتیدەرە کە ئێمە لە یەکتر جیاوازین و هیچ کێشەیەکیشمان لەبارەی جیاوازییەکانمانەوە لە بینینی شتەکاندا نییە. ئەمە یارمەتی منیش دەدات بزانم کە ئەو بەڕاستی پێویستی بە چییە و ڕێزی لێبگرم و ڕێز لەوشتانە بگرم کە بەلای ئەوەوە گرنگن.

ئەوەم بە دڵە کە (میتزی) زۆر مێینەیە. یەکێك لەوشتانەی (جۆن) وتی و منی ترساند ئەوە بو کە کاتێك پیاوان تەمەنیان هەڵدەکشێت، بە شێوەیەکی سروشتی مێینەییان زیاتر دەبێت و پێویستە وریابن کە لە نێرینەییدا بمێننەوە. ئەوە بەلای منەوە ئاساییە، بەڵام ئەوەشی درکاند کە ژنان بەرەو ئەوە دەچن کە نێرینەتر ببن و پێویستە پەیوەندییان بە مێینەتییەوە بمێنێتەوە. پێم گوت (لەوە دەترسم کە بیر دەکەمەوە ڕەنگە لە کۆتاییدا ببێت بە پیرەمێردێکی بۆڵە بۆڵکەر. با هەوڵ بدەین ئەم شتە ڕونەدات.) ئەمە بریتییە لە مەسەلەی کارکردن لەسەر شتەکان و خزمەتکردنی پێویستییە مێینەکان.

**لەوە دەترسم کە بیر دەکەمەوە ڕەنگە لە کۆتاییدا ببێت**
**بە پیرەمێردێکی بۆڵە بۆڵکەر. با هەوڵ بدەین ئەم شتە ڕونەدات.**

بەڵام من هەر بەرنامە کۆنەکەمم پاراست. یەکەم هەفتە کە پێکەوە بوین، پێم گوت، (چاوەڕوانی ئەوەم لێ مەکە کە هاوسەرگیری بکەین. من بەڕاستی بڕوام پێی نییە.) ئەویش ئەمەی بەلاوە ئاسایی بو. دوای ئەوە هەرگیز تەنانەت بە باسکردنیش باسی هاوسەرگیریشمان نەدەکرد.

ئێستا پێنج ساڵە هاوسەرگیریمان کردووە. چوین بۆ چادرگە بۆ دۆڵێکی زۆر دورە دەست لە (کاوای). لە بیرمە ڕۆژی لەدایکبونم بو. (٢٠)ی ئاب. کەلە خەو هەڵسام بە تەمای هیچ نەبو. بەرنامەمان دانا کە لەگەڵ چەند (هیپی)یەکی بەتەمەندا کەبە (یاخییەکان) ناودەبران و لەوێ بینیبومان بە شاخدا سەرکەوین.

لە جوانترین شوێن کە تا ئەو کاتە بینیبوم کۆتاییمان بە گەشتەکە هێنا: کە بریتی

بو لە زنجیرەیەك تاڤگە لە نشێوێکدا، دەبێ (باخی عەدەن)ە رەسەنەکە ئەوێ بوبێت. من و (میتزی) چوین بۆ بەرزترین تاڤگەکان و پێکەوە چوینە ئاوەکەوە و خۆرەتاو لێی دەداین و ئاوەکە لە خوارمانەوە دەرژایە خوارەوە. لە پڕ بیرۆکەیەکی شێتانە بەبێ هیچ ئاگادارییەکی پێشوەخت هاتە مێشکمەوە: پێویستە داوا لە (میتزی) بکەم هاوسەرگیریم لەگەڵدا بکات.

من بە هیچ جۆرێك لە ژێر فشاردا نەبوم؛ من لەگەڵ ئەو کەسەدام کە زۆرم خۆش دەوێت؛ ئەمە رۆژی لەدایکبونی منە و خۆشترین شوێنی سەر زەوییە.

بەڵام وشەکان نەدەهاتنە دەرەوە. دواجار دوای سێ چوار خولەك زمان تەتەڵەکردن توانیم داواکەی لێ بکەم.

پرسی (چی؟) و من ناچار بوم داواکەم دوبارە بکەمەوە.

(میتزی) وتی (بە دڵنیاییەوە.)

لەوکاتەوە زۆر باسی ئەم بابەتەمان نەکردووە، بەڵام نامەیەکی کریسمسمان بۆ هاوڕێکانمان نارد پێمان راگەیاندن کە ئێمە دەستگیرانین. زۆرم پێخۆشە، کە بەبێ هەستکردن بە فشار بڕیارێکی لەم جۆرەم داوە. پێکەوە بونمان هەتا هەتایە بێ هیچ ئەملاوئەولایەك.

## فێربونی خۆ دەربڕین

(کایل) ئەمەی گێڕایەوە: نزیکەی سێ ساڵ لەمەوبەر هاوڕێیەکم پەیوەندی پێوەکردم و گوتی (پێویستە گوێ لەم پیاوە بگریت. ناوی (جۆن گرەی)ە. دەزانم تۆ و گاری دەچن بۆ وەرگرتنی راوێژی کەپڵەکان و دڵنیام هەردوکتان سودی لێ وەردەگرن...) ئەو بە جۆش و خرۆشێکی زۆرەوە ئەمەی دەگوت و باسی ئەوەی دەکرد چۆن ئەم زانیارییانە لە هەمو ئەو شتانەی دیکە کە ئەو بیستبونی جیاوازن. (پیاوان لە مەریخەوە هاتون ژنان لە ڤینۆسەوە) - ئەمە ناونیشانی ئەو کتێبە بو کە سەرنجی راکێشام، بەم شێوەیە هەوڵێکی زۆرمدا لەگەڵ (گاری) هاوسەرم کە لە سیمینارەکەدا لەگەڵمدا بەشدار بێت. ئەو گوتی (ئەگەر ئەمەش یەکێکی دیکە بێت لە زەمکردنی

خەسڵەتە نێرینەکان، بەجێی دەهێڵم.)

## ئەگەر ئەمەش یەکێکی دیکە بێت لە زەمکردنی خەسڵەتە نێرینەکان، بەجێی دەهێڵم.

ئێمە هەدوکمان کراوە بوین و سوربوین لەسەر فێر بون، بەڵام کاتێك (جۆن) باسی ئەوەی کرد چۆن ژنان پێویستیان بەوەیە بایەخیان پێبدرێت، سەرم سوڕما. لەوکاتەدا، من وەکو ژنێك هێزی بایەخپێدانم نەدەزانی، بۆیە روبەروی (جۆن) وەستامەوە. هاوارم کرد (ئێمە دەتوانین خۆمان بایەخ بە خۆمان بدەین! ئێمە زۆر بە توانایین. ئێمە دەتوانین هەمو ئەو شتانە بکەین کە پیاوان دەتوانن بیکەن!) بەمەش پشتگیرییەکی زۆرم لە ژنانی ئامادەبووەوە بە دەستهێنا. گوێم لە - هاواری پشتگیرییەکانیان بو.

(جۆن) نەرم و نیان بو لەگەڵمدا و داوای لێ کردم بسورێمەوە و کراسەکەم نیشانی ئامادەبوان بدەم: لەسەر سنگەکەی بە پیتی رەش نوسرابو (لەشفرۆش، لەشفرۆش، لەشفرۆش.) ئامادەبوان دایانە قاقای پێکەنین. پاشان (جۆن) دەستی کرد بە رونکردنەوە و وای لە من کرد ئەو بەشە گرنگەی مەتەڵەکە بدۆزمەوە کە ئاشکرا بو ئامادەم بۆ دۆزینەوەی. ئەو پێی گوتم کە بەشێك لە مێینەبونی من سەرکوتکراوە، بۆیە من رێگە بە خۆم نادەم کە بایەخم پێبدرێت. نەمدەزانی چەند بێزار بم لێی لە ناو جانتای ئازارەکانمدا هەڵگرتبو - بە منداڵی باوکم لە روی جەستەیی و سۆزدارییەوە بە خراپی مامەڵەی لەگەڵ کردبوم و بەهۆی رێز لێنەگیرانم و بایەخ پێنەدانم لەلایەن باوکمەوە بەرەو ئەوە چوبوم خەسڵەتی نێرینەیی بەرجەستە بکەم. من هاوسەنگیم لەدەست دابو.

بە تەماشاکردنی دایکیشم کە ئەویش وەك من بە خراپ رەفتاری لەگەڵ دەکرا رەفتارەکەم پتەوتر دەبو. کە گەورەش بوم، ئەو بیروبۆچونانە وایان کرد، یەکێك لە کارەکانی هاوسەرەکەمم لە پەیوەندییەکەدا بگرمە ئەستۆ. بۆیە پێویستییەکانی ئەو تێر نەدەبون. ئەو هەستی پیاوەتی روشابو و لە کاتێکدا من بڕوام وابو - بە شێوەیەکی نیمچە ئاگایانە - کە من پێویستە هێز لە دەست پیاوان دەربهێنم بۆ ئەوەی چیتر ئازار نەدرێم. هەمو ئەمانە لە ترسەوە سەرچاوەیان گرتبو، دیارە خۆشەویستی ناتوانێت لە

ترسەوە دروست ببێت. (جۆن) یارمەتیدام دەرگاکە بکەمەوە بەروی هەمو ئەو هەستانەدا، و پاش بەشدارن لە زنجیرە وانە و وۆرکشۆپێك و خوێندنەوەی کتێبەکانی (جۆن)و گوێگرتن لە کاسێتەکانی، وردە وردە گۆڕام.

بایەخ پێبەخشین دیارییەکی نایابە بۆ لایەنە مێینەکەی من. ئەمە ئەزمونێکی چارەسەرکار بووە بۆ رۆحم. هاوسەرەکەم ئێستا شتی وام بۆ دەکات کە دەتوانم بەڕاستی نیشانی بدەم کە دەینرخێنم و هەتا زیاتر پێزانینەکانم دەربخەم، دەیەوێت شتی زیاترم بۆ بکات. ئێستا (زەحمەتم بۆ دەکێشێت) و لەبری ئەوەی هەست بە نائاسودەیی بکەم — هەست بکەم کە پێویستە هەمو شتەکان خۆم بە تەنیا ئەنجامیان بدەم و لاوازیی نیشان نەدەم — وا هەست دەکەم کە بەراستی خۆشەویستم و بایەخم پێدەدرێت. کلیلەکە ئەوەیە کە پێویستە رێگە بدەم ئەمە روبدات، فێری متمانە کردن ببم و هێندە سڵ نەکەمەوە.

**لەبری ئەوەی هەست بە نائاسودەیی بکەم — هەست بکەم کە پێویستە هەمو شتەکان خۆم بە تەنیا ئەنجامیان بدەم و لاوازیی نیشان نەدەم - وا هەست دەکەم کە بەراستی خۆشەویستم و بایەخم پێدەدرێت.**

ئەنجامی فێربونی متمانەکردن بە هاوسەرەکەم ئەوە بو بوژامەوە. بە هۆی فێربونی متمانە پێکردنییەوە، بینیم ئەویش دەبوژێتەوە. لە رێگەی هاندانییەوە بینیم دەگاتە ئاستی بەرزتر، و منیش زیاتر و زیاتر پەسەندم دەکرد. ئەو دەستی کرد بە پشتڕاستکردنەوە و دڵنیا کردنەوەی من، بەمەش رێز لە خۆگرتنم زیادی کرد. من لایەنە مێینەکەی خۆمم بە دەست دەهێنایەوە و لە ناویدا دەگەشامەوە وەك ئەوەی لە وەرزێکی گەرم و خۆرەتاودا بم - هەرگیز نەمدەزانی دەتوانم ئەو هەستە نایابەم هەبێت. هەمو ئەو پێویستییە سەرەکییانەی (جۆن) فێری کردین وایان لێ کردین هەردوکمان لە خۆشەویستیدا گەشە بکەین. بۆم دەرکەوت هیچ دەسیسەیەك نییە بۆ سەرکورتکردنی ژن و کۆنترۆڵکردنی. هەر ئەوە بو کە پیاوان و ژنان پێویستییەکانیان لە یەکتر جیاوازە. بۆم دەرکەوت

گرنگترین ئەرك ئەوەیە هەوڵ بدەین بۆ ناسینەوەی ئەو جیاوازییانە بناسینەوە و ڕێزیان لێ بگرین.

**بۆم دەرکەوت هیچ دەسیسەیەک نییە**
**بۆ سەرکوتکردنی ژن و کۆنترۆڵکردنی.**

هاوکات لەگەڵ ئەوەدا کە من فێر دەبوم بوار بە (گاری) ببەخشم بچێتە ئەشکەوتەکەیەوە، (گاری) لە (جۆن)ەوە فێردەبو بەبێ ئەوەی چارەسەرم بداتێ گوێم لێبگرێت. ئەو پێی گوتم کە ئەمە سەختترین شت بووە بەلایەوە: کارەکەی ئەوەبو وەڵام بداتەوە، لەبەرئەوە کە یەکەمجار فێری ئەوەبو تەنیا گوێبگرێت، لەڕاستیدا بە توندی دەستی خستە سەر دەمی. ئەمە بەڕاستی ناخۆش بو بۆ ئەو، لەگەڵ ئەوەشدا من بە گاڵتە وەرم گرت. ئێمە ڕاهێنانمان کرد، و (گاری) هەمو شتێك تێگەیشت، و ئێستا کاتێك من دەچمە ناو قوڵترین و تاریکترین شوێنمەوە کە پێی دەگوترێت (بیر)، (گاری) گوێم لێ دەگرێت و ئاسودەم دەکات. بە هۆی پشتگیرییەکەی ئەو و تێگەیشتنیەوە لە پێویستییەکانی من، زۆر بە خێرایی سەردەکەومەوە، جار لەدوای جار زیاترم خۆش دەوێت و بەهەند وەریدەگرم لەبەرئەوەی گوێی لێ گرتوم.

من ئێستا نەك تەنیا باشتر لە پیاوان تێگەیشتوم، بەڵکو تێگەیشتنێکی باشتریش لە خۆم تێگەیشتوم. لابردنی بەربەستەکان و ڕێگەدان بە (گاری) بۆ ئەوەی بتوانم خۆشەویستییەکەی لێ وەربگرم و خۆشەویستی خۆمی بدەمێ دیارییەکی گەورە بووە بۆم. خۆشییەکی گەورەیە بۆ من کە باسی ئەو ئەزمونە ڕۆشنکەرەوەیە بکەم کە لە گەشتەکەمدا لەگەڵ کارەکانی (جۆن) پیایدا تێپەڕیوم.

### دەستپێکردنەوە لە سەرەتاوە

چیرۆکەکەی (ڕۆبێرت) بیرمان دەخاتەوە ئەو شتانە بنرخێنین کە هەمانن. (دۆرین)م لە داوەتێکی گۆشت برژاندندا لە ماڵی خۆمان لە ساڵی ١٩٩١ ناسی. من نزیکەی دە ساڵ بو جیابوبومەوە و ڕەبەن بوم. تەمەنم پەنجاو سێ ساڵ بو، ئامادە بوم

هاوسەرێك بدۆزمەوە کە دەستکەوتەکانمی لەگەڵدا بەش بکەم و شەو و رۆژی لەگەڵدا ببەمەسەر. (دۆرین) سی و پێنج ساڵ لە هاوسەرگیرییەکدا بووە کە بە قسەی خۆی ناخۆش و خراپ بووە. کاتێك یەکترمان بینی نزیکەی ساڵێك دەبو جیابوبۆوە. ئەو گوتی (من هێشتا بۆ پەیوەندی ئامادە نیم.)

قەیناکە، من کەسێکی پشوو درێژم.

پاش سێ هەفتە بەسەر ئەو گۆشت برژاندنەدا، ئێمە پێکەوە دەژیاین. زۆری پێنەچو دوای ئەوە، هاوسەرگیرییمان کرد.

پەیوەندییەکەمان هیچ بەرنامەیەکی شاراوەی نەبو، پێویستی بە پشتگیری نەبو. بەخششێکی تەواو بو. سەبارەت بە شتە ماددییەکان، ئێمە هەمو شتێکمان دو دو هەبو- خانو، ئوتومبیل، و کەل و پەلی ناو ماڵ. بەرنامەکەمان ئەوە بو چێژ لە یەکتر، لە ژیانمان، و لە ساڵە زێڕینەکانمان ببینین. و لە روی داراییەوە ئاسودە بوین. توانیمان ئەوە بکەین.

من لە کارگەیەکی بەرهەمهێنانی وزەدا کارم دەکرد و ئەویش لە عیادەکاندا پارێزەری نەخۆش بو. ئێمە هەردوکمان کەسی پیشەیی بوین، ئەو خانمێکی زۆر زیرەك و سەرکردە بو. زۆر بە خێرایی ئەو بیرۆکە باشەمان بۆ هات کە واز لە (پاس)ی هاتوچۆپێکەری کارەکەمان بهێنین و پێکەوە بچین بۆ شوێنی کارەکانمان. ئەو بەیانیان لە کارگە دایدەبەزاندم و پاشان نیوەڕوان دەهاتەوە بە شوێنمدا. ئەوە شتێکی زۆر باش بو، چونکە دەمانتوانی پێکەوە قسە بکەین. دەمتوانی (جێب)ەکەی ببینم کە بە رێگاکەدا دەهات و خۆیم دەهێنایە بەرچاو کە بەرز و نزم دەبێتەوە. ئەوە بەراستی نایاب بو.

(دۆرێن) ماوەیەکی کەم دوای هاوسەرگیرییەکەمان پرسی، (ئایا هەرگیز چویت بۆ ئۆپێرا؟) گوتم (نا، بەلام حەز دەکەم.) ڤیژاندی وتی (زۆرم پێخۆشە هەرگیز نەمتوانیوە کەسێك بدۆزمەوە بێت لەگەڵمدا) یەکەم ئۆپێرا کە چوین بریتی بو لە (هاوسەرگیرییەکەی فیگارۆ). حەزم لێ کردو چومە دەرەوە و دوو جلی بۆنەکانم کڕی. با لەلاوە شتێکیشتان پێبڵێم، دوای ئەوەی (دۆرین) مرد، کۆمپانیایی ئۆپێرای (سان دیاگۆ) نمایشێکی (مەکبێس)ی پێشکەشکرد، کە هاندەرێکی بە وەفای ئەو کۆمپانیایە. کاتێك (دۆرین) شتێکی پێویست بوایە یان بیویستایە شتێك ئەنجام بدات، هەرگیز بەو

خانمەم نەدەوت نەخێر. ئەگەر لە روی جەستەیی، ئەقڵی یاخود دارایی مندا بوایە ئەو شتەمان دەکرد. و من دەزانم بۆچی: چونکە من بۆ ماوەیەکی زۆر کەم ئەوم هەبو. تەنیا سێ ساڵ بو، بەڵام ئەگەر کەسێك پێی بوتمایە کە بۆ ماوەی سێ رۆژ دەبێت، سێ کاتژمێر، سێ چرکە، هەر ئەنجامم دەدا، چونکە ئەوە خۆشەویستی راستەقینە بو. وابزانم هۆکارەکەی ئەوە بو کە ئێمە پێگەیشتو بوین. دەمانزانی چیمان دەوێت، و باسمان دەکرد. لە هاوسەرگیری پێشودا هاوسەرەکەی پێی دەگوت ناتوانن فلانە شت بکرن یاخود فیسارە کار ئەنجام بدەن، لەبەرئەوە خۆی بە تەنیا دەچو بۆ گەشتکردن. بۆ منیش هەروا بو؛ پێشتر هەرچیەکم کردبێت بە تەنیا کردومە.

---

**تەنیا سێ ساڵ بو، بەڵام ئەگەر کەسێک پێی بوتمایە کە**
**بۆ ماوەی سێ رۆژ دەبێت، سێ کاتژمێر، سێ چرکە،**
**هەر ئەنجامم دەدا، چونکە ئەوە خۆشەویستی راستەقینە بو.**

---

بۆیە دەستمان کرد بە گەشتوگوزار. چەند گەشتێکی نایابمان ئەنجامدا - بۆ (فیجی)، (نیوزلاند)، (ئوسترالیا)، و (کابۆ سان لوکاس). کە گەڕاینەوە دەستمان کرد بە گەڕان بەدوای شوێنێکدا بۆ ژیان. (دۆرین) نەیدەویست چیتر لە (کالیفۆرنیا) بژی، بۆیە خانویەکی گەڕۆکمان کڕی و کەوتینە رێ - (ئاریزۆنا)، (نیومەکسیکۆ)، (کۆلۆرادۆ)... چوین بۆ هەمو شوێنێك. و پاشان رۆژێکیان شوێنێکم بیر کەوتەوە کە پێشتر چوم بوم: شاری (سێدار) لە (ئۆتاه). بە خانووە گەڕۆکەکەمان چوین بۆ ئەوێ و ئەوەش سەرنجراکێش بو. ڤیستیڤاڵێکی (شەکسپیر)ی لێ بو، و(دۆرین) حەزی لە شوێنەکە کرد. کاتێك بە شەقامەکەدا دەڕۆیشتین، لە پڕ (دۆرین) گوتی (ئەوە چییە؟) لەسەر گردەکە خانویەکی تەواو نەکراوی سێ نهۆمی دارین هەبو. دەڵاڵێکمان برد تەماشای بکات و بۆمان دەرکەوت کە خاوەنەکەی پێویستی زۆر بە پارەیە. ئێمە ٨٠ هەزار دۆلارمان دایە و تەواو. کڕیمان.

لە مانگی حوزەیراندا خانووەکەی (دۆرین) لە (کالیفۆرنیا) فرۆشرا. لە مانگی تەموزدا خانووەکەی من فرۆشرا. لە مانگی ئابدا خانووەکەمان داخست لە شاری

(سێدار) و بەڵێندەرێکمان گرت و ئەو شوێنەمان کرد بە شوێنێکی نایاب — بو بە تاکە ماڵی هەمو (ئوتاه) کە تەواڵێتێکی پێشکەوتوی هەبێت.

لە ١٤ ی ئەیلولدا دەرکەوت کە (دۆرین) توشی نەخۆشی (هەوکردنی ماسولکە و پێست) بووە.

لە ١١ ی کانونی یەکەمدا، (دۆرین) کە خانووەکەی بە تەواوکراوی نەبینی، مرد.

ئەمە نوکتەیەکی ناخۆش بو بۆ من. هەمو بەرنامەکەم لە دەستدا، چونکە بەرنامەکەم بریتی بو لە (دۆرین). هەمو ئەرك و واتایەکم لە دەستدا. پرسەکەی (دۆرین) لە رۆژی ١٦ی کانونی یەکەمدا بو، لە ٢١ ی کانونی یەکەمدا برامە خانووەکەوە. لە رۆژی مردنەکەیەوە تا نزیکەی مانگی تەموز تەماشای دادگایکردنەکەی (ئۆ.جەی.سمسن)م دەکرد، هەمو رۆژەکەم بەوە بەسەر دەبرد. چل پاوەند کێشم زیادی کرد، کەمەرم پێنج ئینج زیادی کرد. هیچ ئارەزویەکم نەبو بۆ ئەنجامدانی هیچ شتێك. تاکە هاورێم بریتی بو لە پشیلەکەمان، (بۆبی)، کە هاورێیەکی سەرنجراکێش بو بۆم. بەڵام من بەراستی وێران بوبوم. من و (دۆرین) خۆمان بۆ وەرزش ئامادە کرد و من هاورێی وەرزشەکەمم لە دەستدابو.

ئەوەی یارمەتیدام بەرنامەیەکی تایبەتی رادیۆ بوم بەرگوێم کەوت. هەفتەی دووجار دەچوم و لەوێ فێری ئەوە بوم کە ئاساییە خەفەت بخۆم و بگریم و هەست بکەم. من بە هیچ جۆرێك نەمدەزانی چۆن خەفەت بخۆم. لە کۆمەڵەکەدا فێری ئەوە بوم کە ئاساییە تورەببم، ئاساییە لە رێگەی درەختە پەسەندەکەیەوە قسە بۆ (دۆرین) بکەم، بچمە (جێب)ەکەیەوە و بگریم، تەنانەت نامەشی بۆ بنوسم. ئەنجامدانی ئەم شتانە ئازار بەخشن، بەڵام ئەوە سەرنجراکێش بو کە توانای هەستکردنم هەیە.

وا دەزانم خەفەت خواردنەکان ئیسراحەتیان دەدامێ. بۆ ماوەی ساڵێك وەکو گۆشەنشینێك وابوم لەسەر چیایەك — لەسەر زەوییەکی ٢٠ ئەیکەر کە سێ میل و نیو لە شارەکەوە دوربو، بە تاقی تەنیا بوم. رێگەمدا خەفەتەکە وەکو شەپۆلێکی گەورە بمشواتەوە. هیچ شتێك نەبو سەرنجم پەرت بکات، کەس نەبو هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەم. تەنیا خەمم دەخوارد و چاك دەبومەوە.

ڕێگەمدا خەفەتەکە وەکو شەپۆلێکی گەورە بمشواتەوە.

پاشان بە هاوڕێیەتی (بۆبی) و پشتگیری کۆمەڵەکە، توانیم بەردەوام بم و دووبارە دەست بکەمەوە بە ژیان. خانووەکەم فرۆشت و چوم بۆ (ئیوجین) و ئاوڕم نەدایەوە. لەوێ خانمێکم بینی، لەوکاتەوە خەفەت و گریان کۆتایی هاتووە، هەرچەندە (دۆرین) هێشتا لە دڵمدا دەژی.

دوای مردنی (دۆرین) بو کە کتێبی (پیاوان لە مەریخەوە هاتون و ژنان لە ڤینۆسەوە) و کتێبی (مەریخ و ڤینۆس لە ژوری نوستن)م بینی. دوای پێنج مانگ بەسەر مردنی ئەودا، توانیم فۆکەس بکەم و ئەو کتێبانە بخوێنمەوە. لەراستیدا ئەو بەتەواوی هەندێك لە چەمکەکانی (د. گرەی) بەکاردەهێنا، بۆ نمونە (ڕۆیشتن بەسەر هێلکەدا). من سوڕی شەپۆلەکانیم بینیبو. توانیم ئەوکاتانە بە بیر بهێنمەوە کە دەچومەوە ناو ئەشکەوتەکەم. دەزانم کاتێك کێشەکانم چارەسەر دەکرد، مەریخیەك بوم بە رم و شمشێر و قەڵغانێکەوە، کە ئامادەبوم هەمو کێشەکانت بۆ چارەسەر بکەم خاتونی باش- ئۆه خاتونی لاواز. بەڵام (دۆرین) لاواز نەبو، و کاتێك کتێبەکەم خوێندەوە سەرم سوڕما و هەستم کرد هەندێك شت هەن ئێستا تێیان دەگەم.

(دۆرین) هەمیشە پێی دەوتم من تاکە پیاو بوم گوێم لێگرتبو، بۆیە بۆم دەرکەوت کە شتێکی چاك دەکەم. بەڵام هەندێك جار کە لە جێگادا بوین قسەی گەرم و گوڕ و خۆشمان دەکرد، لە پڕ دەبو بە زستان لە بەستەڵەکی باشور. دەمپرسی، چی رویدا؟

خودە مەریخیەکەی من هۆکار بو کە دەیگوت نیگەران مەبە، من چارەسەری دەکەم. ئەمە سەرکەوتو نەبو، کتێبەکە ئەمەی بۆ روون کردمەوە. لە کتێبەکەوە ئەوەم بۆ دەرکەوت کە مەسەلەکە خۆپەرستی هیچ لایەکمان نەبو؛ بەڵکو ئەوە بو کە ئێمە کەمتەرخەم بوین لە هونەرە پڕهۆگرییەکەی گوێگرتن. لە بری ئەوەی هاوبەشەکەت ببیستیت، گوێی لێ دەگریت. ئەمە ئەوەیە کە کتێبەکە نیشانی داوم.

کتێب و قسە زۆر بەهێزن لە تواندنەوەی شتەکاندا. هەمو جۆرە پاشماوەیەکی (خود) دەشۆنەوە و ناڕاستی دەیسڕنەوە - هەروەها ئەو هەستانەش دەتوێننەوە کە هەڵەن. سەبارەت بە من، زانیارییە نوێیەکەمیان پتەوتر کرد کە لە کاتی لە

دەستدانەکەدا هەر هەستێکم هەبوبێت ئاسایی بووە. کاتێك تۆ هاوسەرەکەت لە دەست دەدەیت، وا هەست دەکەیت چیتر پێویست نیت و رێزت لێ ناگیرێت. ئەمەش رێك ئەوە بو کە من هەستم پێکرد: "نەبونی پێویستیی بە تۆ" ئێستا ئەوە دەزانم.

لە پەیوەندییە تازەکەمدا ئەو شتانەی لە (د. گرەی) فێریان بوم زۆر بەباشی کار دەکەن. بە زۆرییش لە هونەری گوێ گرتندا. هاوڕێ تازەکەم ئەوە بە بەهایەك دەزانێت؛ دەیەوێت گوێی لێ بگیرێت. (من زۆر ماندوم. سەرمامە. رۆژێکی سەختم بەسەربردووە.) من سیندرۆمی (کاك چاکی بکە) سەرکوت دەکەم و تەنیا گوێ دەگرم. کاتێك تەماشام دەکات و دەڵێت (بۆب)، تۆ بە شێوەیەکی سەرسامکەر تێدەگەیت)، منیش لەبەر خۆمەوە دەڵێم (هەردوکمان سوپاست دەکەین د. گرەی). پەراوێزێك: ئەمساڵ ئەو خانمە جوانەم کرد بە هاوسەری خۆم کە لە سەرەوە باسم کرد. لە ماڵەکەمدا دوو کتێبمان هەیە کە رێنمای ژیانمانن (ئینجیل) و کتێبی (پیاوان لە مەریخەوە هاتون و ژنان لە ڤینۆسەوە).

## ٧
## مەریخ و ڤینۆس پێکەوە هەتا سەر

خۆشەویستی دەتوانێت تەمەنێك درێژە بکێشێت، بەڵام پێویستی بەوەیە بە بەردەوامی واز لە چاوەڕوانییەکانمان سەبارەت بە چۆنێتی رەفتارکردنی

هاوبەشــەکەمان بهێــنین و هــەروەها پێویســتە تێگەیشــتن و قبــوڵکردنێکی گــەورەتر بدۆزینەوە. قبوڵکردنی ئەوەی کە ئێمە لە هەسارەی جیاوازەوە هاتوین ئازادمان دەکات بتــوانین پەیوەنــدی دروســت بکــەین بــۆ ئــەوەی پێوســت بکــات یــەکتری بگــۆڕین ئــەم زانیارییــە نوێیــە یارمــەتیمان دەدات تێبگــەین بۆچــی بیرکردنــەوە و هەســتکردنی هاوبەشەکەمان وەك هی ئێمە نییە.

بەڵام هەندێك شت هەن لـە پەیوەندییەکدا روو دەدەن کـە قبـوڵ نـاکرێن؛ هەنـدێك هەڵسوکەوت هەن کە دەبێت بگۆڕدرێن بۆ ئەوەی خۆشەویستی گەشـە بکـات. لێبـوردەیی مانـای ئـەوە نـییـە رەفتـاری خـراپ قبـوڵ بکـەیت و باوەشـی بـۆ بکەیتـەوە. بـۆ ئـەوەی خۆشەویست بین پێویستە سنور و هێڵەکان دیاری بکەین.

**لێبوردەیی مانای ئەوە نییە رەفتاری خراپ قبوڵ بکـەیت و باوەشی بۆ بکـەیتەوە.**



هەنـدێك هەڵسوکەوت - وەکـو توندوتیـژی، کێشـەکانی ئـالودە بـون، درۆ و خیانـەتی هاوســەرگیری — ئاشــکرایە کــە قبوڵنــەکراون. پێویســتە بڵــێین، "ئەمــە قبوڵنــەکراوە و پێویستم بەوەیە بە روونی دەدان بە هەڵەکەتدا بنێیت و پەیمان بدەیت هـەرگیز دووبـارەی نەکەیتەوە. هەست دەکەم پـێش ئـەوەی بتـوانم جارێکی دیکـە متمانـە بـە پابەندییەکەت بکەمەوە کە چیتر ئەم کارە ناکەیت، تۆ یان هەردوکمان پێویستمان بـە یارمـەتی کەسـێکی شارەزا و پیشەیی هەیە." ئەگەر هاوبەشـەکەت ئامادەیی تیـا نـەبێت دەدان بـە هەڵەکەیـدا بنێت یاخود وەرگرتنی هاوکاری بە پێویست نەزانێت، ئەوا لە زۆربـەی حاڵەتەکانـدا تاکـە وەڵامـی خۆشەویسـتانە ئەوەیـە رێگـە بـە هاوبەشـەکەت بـدەیت بەرپرسـیار بێـت لـە چاککردنەوەی خۆی بە شێوەیەکی کاتیی ماوەیەك لە یەکتر جیا ببنەوە.

دەشـێت رەتکردنـەوەی هەڵسوکەوتی نایارمەتیـدەر وەکـو کـارێکی ناشـرین دەربکـەوێت چونکە تۆ ئەوەت "مەبەست"ە کە دەیڵێیت، بـەڵام ئەمـە خۆشەویستی نـییـە کـە رێگـە بـە کەسێك بدەیت بە بەردەوامی ئازارت بدات. هەنـدێك جـار گـەورەترین کێشـەو نارەحـەتی لـە

پەیوەندییدا ئەوەیە کە میهرەبانانە و عاشقانە و بە لێبوردەییەوە سنورەکان دیاری بکەیت.

هەمو کەسێك هەڵە دەکات. لێبوردن لە هەڵە کردارێکی عاشقانەیە. لێبوردەیی خۆشەویستییەکەمان بەهێز دەکات. ئەم لێبوردەیی‌یە بە جۆرێك لە جۆرەکان مەشق بە خۆشەویستییەکەمان دەکات و بەهێزی دەکات. بەبێ لێبوردەیی ناتوانین لە خۆشەویستیدا گەشە بکەین. لێ نەبوردن هەمان ئازار بەخۆمان دەگەیەنێت کە بە هەڵەکەرەکەی کردووە. کاتێك لە کەسێك نابورین، بەردەوامی بە ئازارەکەمان دەدەین و کەسەکەی بەرامبەر دەخەینە بارودۆخێکەوە کە نەتوانێت بگۆڕێت.

---

**لێ نەبوردن هەمان ئازار بەخۆمان دەگەیەنێت**
**کە بە هەڵەکەرەکەی کردووە.**

---



لێبوردن بریتییە لە بەرەڵاکردنی ئازارەکانمان. هەروەها بریتییە لە وازهێنان لە هەوڵدان بۆ گۆڕینی کەسەکە. هەندێك جار ئێمە بە شێوەیەکی ناکارا ڕەفتاری خراپ قبوڵ دەکەین بە هیوای ئەوەی کەسە خۆشەویستەکەمان بگۆڕێت. ئەم بەرگریکردنە خۆبەدەستەوەدەرانەیە، لێبوردەیی نییە و بە گشتی کارێکی بێسودە. ئەمە تەنیا کێشەکان قوڵتر دەکاتەوە. یەکەم تەحەدا و ئەرکی "قوربانی"یەکە ئەوەیە کە خۆی لە ئازاری دووبارە بپارێزێت و پاشان هیوای باش بۆ کەسەکەی دیکە بخوازێت. ئێمە پێویستە هەوڵ بدەین هاوبەشەکانمان بە جۆرێك ببینین کە ئەوەندە بە توانابن دواجار بەبێ یارمەتی ڕاستەوخۆی ئێمە بگۆڕێن.

لە سیمینارەکانمدا فۆکەس دەخەمە سەر هەمو شتە بچوکەکان، سەر ئەو هەڵە بچوکانەی کەپڵەکان دەیکەن لەبەرئەوەی بەراستی لە یەکتر تێناگەن. لێبوردن لەم هەڵە بچوکانە کارێکی ئاسانە، لەبەرئەوەی هەڵەی بچوکن و هەروەها لەبەرئەوەش کە ئاشکرایە هۆکارەکەیان بریتییە لە کەمتەرخەمی هاوبەشەکەمان. ئەمان هەر هێندە دەزانن، ئەمان لە هەسارەی جیاوازەوە هاتون. کەپڵەکان پێکەوە بە هەڵەکانیان پێدەکەنن.

هەرچەندە من لە سیمینارەکانمدا راستەخۆ زۆرێك لە هەڵە گەورەکان نابینم، بەڵام کەپڵەکان نامەم بۆ دەنوسن و باس لەوە دەکەن چۆن ئەو ژینگەیە " موعجیزە ئاسا" یارمەتی داون لە هاوبەشەکانیان و لە خۆیان ببورن کاتێك هەڵەی گەورەیان کردووە. فێربونی لێبوردن لە هەڵە بچوکەکان، وایان لێ دەکات بتوانن کێشە گەورەکان چارەسەر بکەن.

فێربونی لێبوردن لە هەڵە بچوکەکان، وایان لێ دەکات بتوانن کێشە گەورەکان چارەسەر بکەن.

ئەگەر ئێمە جەخت بخەینە سەر لێبوردنی شتە ئاسانەکان، ئەوا وردە وردە توانامان بۆ لێبوردن بەهێز دەبێت و بەم جۆرە دەتوانین بەرامبەر شتە گەورەکانیش لێبوردە بین. ئەگەر تۆ کەسێکی بێهێزییت بارێکی قورست هەبێت هەڵی بگریت، دیارە باشترین شت ئەوەیە کە بە هەڵگرتنی بچوکترین و ئاسانترین پارچە دەست پێبکەیت تا ئەوکاتەی هێزت بۆ دروست دەبێت، ئینجا پارچە هەرە قورسەکان هەڵبگریت. بە هەمان شێوە، لە پەیوەندییدا، بە کێشە پچوکەکان دەست پێبکە؛ پاشان، چارەسەرکردنی کێشە گەورەکان ئەو گەورەیی و سەختییەیان نامێنێت.

## لێبوردن و داوای لێبوردن

توانای داوای لێبوردنکردن بە ئەندازەی لێبوردن گرنگە. لێبوردن و لە ئەستۆ گرتنی بەرپرسیارێتی بۆ راستکردنەوەی هەڵسوکەوت دوو باڵەکەی خۆشەویستیین. وەك چۆن لێبوردن کاتی دەوێت، چاککردنەوەی هەڵسوکەوتیش کاتی دەوێت. کە قەیرانێك لە پەیوەندییەکدا هەبێت، هەمیشە دوو جەمسەر هەن لە کاردان. ئەو کەسەی هەڵەکەی کردووە پێویستی بەوەیە داواکردنی لێبوردن لەبەرچاو بگرێت و هاوبەشەکەی دیکە پێویستی بەوەیە لێبوردن لەبەرچاو بگرێت. برینەکە زۆر باشتر سارێژ دەبێت ئەگەر هەردو لایەنەکە لە پرۆسەی سارێژبونەوەکەدا بەشداری بکەن.

کارێکی سەختە بتوانیت لە هاوبەشەکەت ببوریت ئەگەر داوای لێبوردن نەکات و کارنەکات بۆ چاککردنەوەی هەڵەکەی؛ هەروەها ئەوەش سەختە داوای لێبوردن بکەیت

و کـار بـۆ چـاککردنەوەی هەڵەکـەت بکـەیت ئەگـەر هاوبەشـەکەت لێـت نـەبورێت. بۆچونێکی زۆر نا واقیعیـیە ئەگەر پێت وابێت هاوبەشەکەت هـەرگیز هەڵـە ناکات، وەك چۆن ناواقیعیـیە گەر پێت وابێت هـەمو هەڵەیـەك بـە ئاسانی دەبەخشرێت. وانـیـە. هەندێك جار لێبوردن چەند مانگێك بگرە چەند ساڵێکی دەوێت.

خۆشویستن بریتییـە لـە نیـازێکی مەبەسـتدار بـۆ خزمـەتکردنی هاوبەشـەکەت بـە پـێی خۆزگـەکانی و هـەروەها کراوەییت بـۆ وەرگرتنـی پشـتگیری هاوبەشـەکەت کاتێـك خزمەتی پێویستییەکانت دەکات. لێبوردن بریتیـیە لە (سەلماندنی ئەوەی کـە تـۆ هێشـتا حـەز دەکـەیت خزمـەتی هاوبەشـەکەت بکـەیت و هێشـتا کراوەیـت بـە جۆرێـك ئـەو هەولانەی لێ قبوڵ بکەیت کـە بـۆ خزمـەتی پێویسـتییەکانی تـۆ دەیانـدات. ئێمـە ئەگـەر کـراوە بـین بـۆ وەرگرتنـی پشـتگیرییەکانی هاوبەشـەکەمان بـەڵام پشـتگیرییەکەمان پێنەگات، دەرگاکە دادەخـەین. رەنگـە هیـوای باشیان بـۆ بخـوازین، و حـەز بـە چاکەیان بکـەین بـەڵام بـۆ ئـەوەی بتـوانین دووبـارە کـراوە بـین بـۆ وەرگرتنـی پشـتگیرییەکانیان پێویستمان بە کات دەبێت.

---

**لێبوردن بریتییە لە (سەلماندنی ئەوەی کە تۆ هێشتا حەز دەکەیت خزمەتی هاوبەشەکەت بکەیت و هێشتا کراوەیت بە جۆرێک ئەو هەوڵانەی لێ قبوڵ بکەیت کە بۆ خزمەتی پێویستییەکانی تۆ دەیاندات.**

---

داوای لێبوردن بریتییە لە وتنی ئەوەی کە لـە وەڵامـەکانی هاوبەشـەکەت تێدەگـەیت و پشتڕاستیان دەکەیتـەوە و ددان بـەوەدا دەنێیت کـە هەڵەیـەکت کـردووە و مەبەسـت و نیـازت ئەوەیـە راسـتی بکەیتـەوە. داوای لێبـوردنکردن ددانـنانـە بـە بەرپرسـیارێتییەکی بێمەرجدا بەرامبەر هەڵەکانت و بە پابەندییتدا بۆ ئەنجامدانی شتێك لەبارەیەوە.

---

**داوای لێبوردنکردن ددانانە بە بەرپرسیارێتییەکی بێمەرجدا بەرامبەر هەڵەکانت و بە پابەندییتدا بۆ ئەنجامدانی شتێک لەبارەیەوە.**

---

لـە راسـتکردنەوەی هەڵسـوکەوتەکەتدا، تـۆ تواناکانـت بـۆ بەخشـین و وەرگرتنـی خۆشەویستی نوێ دەکەیتەوە. لـە لێبـوردنی هەڵەیەکدا، تۆ هاوکات ئـەو هەلـە دروست دەکەیت کە هـەم بکرێیتـەوە و هـەم دووبـارە خۆشەویستی ببەخشیت و وەری بگریـت. بەم جۆرە، لێبوردن و بەرپرسیارێتی شانبەشانی یەکتر دەڕۆن.

## پەیوەندییە ناتەندروستەکان

لـە پەیوەندییـەکی ناتەندروسـتدا، زۆرجـار ئاشـکرایە کـێ بەرپرسـیارە - بـە تایبـەتی ئەگەر کێشەکە گەورە بێت. بە گشتی مرۆڤی باش و مرۆڤی خراپ هـەن. لـە حاڵـەتی وادا، جیابونەوە تاکە وەڵامە. لەم حاڵەتانەدا، تاکە خـەتای قوربـانـیەکە ئەوەیـە کـە کەسـێکی وای کردووە بە هاوبەشی خۆی؛ بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، ئەو کەسە پێویستە لێبوردە بێت.

هاوکات لەگەڵ ئەوەدا قوربانییەکە پێویستی بە ماوەیەکە بـۆ فۆکـەس کردنـە سـەر دۆزینـەوەی لێبـوردەیی، هاوبەشـەکەی فۆکـەس دەکاتـە سـەر دۆزینـەوەی چارەسـەر و کەسی یارمەتیدەر بۆ چارەسەر کردنی ئەو کێشەیەی کە خـۆی دروستی کـردووە. تـەنیا دوای تێپەڕبونی کات و سارێژبونەکانە کە کەپڵەکە دەتوانن بڕیار بـدەن ئایا دەگونجێت پێک بێنەوە یان نا.

چـۆن دەزانیـت کـە پێویسـتە چ کاتێـک دووبـارە هـەوڵ بدەیتـەوە؟ کـەس ناتوانێـت وەڵامـی ئـەو پرسـیارەت بـۆ بداتـەوە؛ پێویسـتە گوێ لـە دڵـە عاشـقەکەت بگریـت. دوای سارێژ بون، هەندێك جار وەڵامەکە ئەمەیـە" مـن ئـەم کەسـەم خـۆش دەوێت، مـن لـەم کەسە دەبورم، ئەو گۆڕاوە بەڵام من نامەوێ هاوسـەری بم." بـۆ خـەڵکی دیکـە وەڵامێکـی دیکـە دێتـە پێشـەوە: "مـن ئـەم کەسـەم خـۆش دەوێت، لێی دەبـورم، ئـەو گـۆڕاوە و مـن دەمەوێت هاوسەری بم."

## پەیوەندییە تەندروستترەکان

کاتێك تەندروستتر و بەرپرسیارتر دەبین لە ژیانماندا، جیاوازی نێوان قوربانیەکە و هەڵەکەرەکـە ئەوەنـدە ئاشـکرا نییـە. ئێمـە هەرچـەندە لـە پەیوەندییـەکی زۆر تەندروستیشدا بین، بەڵام هێشتا ئەگەری ئەوە هەیە هاوبەشەکەمان هەڵەی گەورە بکات.

بـۆ نمونـە، کاتێـك ژنێـك پەیوەندییـەکی دەرەکـی هەیـە، پیـاو دەتوانێـت بگـەڕێت بزانێـت چـۆن هەڵسوکەوتەکانی خـۆی بەشـێك بـون لـە هۆکارەکـانی ئـەم پرۆسـەیە. هەرچەندە ئاشکرایە کە ژنەکە هەڵەیەکی گەورەی کردووە(پەیوەنـدی دەرەکـی دروست کردووە یان درۆی کردووە)، بەڵام پشتگوێخستنی ژنەکە هۆکارێك بوە.

بە تایبـەتی بەتێگەیشـتنێکی نـوێوە کـە چـۆن پیـاوان و ژنـان لـە یـەکتری جیـاوازن، پیاوەکـە دەتوانێـت ببینێـت چـۆن بـە چـەندین ڕێگـەی بچـوك بەشـدار بـووە لـە دروسـتکردنی ئـەم ناپاکیـەدا. تـەواو ئاشـکرا نییـە خەتاکـە هـی کێیـە. لـە حاڵـەتی وادا، سارێژبونەکە ڕەنگە خێراتر روبدات و بەگشتی کەپڵەکان دەگەڕێنەوە لای یەکتر.

**لە پەیوەندییە تەندروستترەکاندا تەواو ئاشکرا نییە کە کێ خەتابارە.**



ئەگـەر پیاوەکـە قوربـانی بێـت، پێویسـتە یەکـەمجار پاشەکشـە بکـات و تەماشـای هەستەکانی خۆی بکات؛ بـەڵام دواتـر پێویسـتە بـە شـێوەیەکی سـەرەکی فۆکـەس بکاتـە سـەر ئـەو ڕۆڵـەی کـە گێڕاویـەتی. کـە تـوانی بابەتییانـە لـە کێشـەکە بڕوانێـت، ئاسـانتر دەتوانێت ببورێت.

ئەم پرۆسەیە کاتێك ڕودەدات کە پیاو تێبگات لـەوەی خـۆی لـە مەریخـەوە هـاتووە و ژنیش لە ڤینۆسەوە. پیاو ڕەنگە هەست بە ئـازار بکـات بـەڵام کاتێـك نمونـە دوای نمونـە ئـەو هەڵانـە دەبیسـتێت کـە هـەمو پیـاوان ئـەنجامی دەدەن، بـۆی روون دەبێتـەوە و دەبینێت چۆن ڕۆڵی هەبووە لەم کێشەیەدا. ئەم بابـەتیبونـە هەڵکشاوە یارمـەتی دەدات لـە هاوبەشـەکەی ببورێـت. هـەتا زیـاتر بتوانێـت ڕۆڵـی خـۆی لـە کێشـەکەدا ببینێـت، بەلایەوە ئاسانتر دەبێت کە بە تەواوی لە هاوبەشەکەی ببورێت.

بـەڵام ئەگـەر (ژن) قوربـانـیـیەکـە بێـت، شـتەکە بـە پێچەوانەوەیە. ئەگـەر ژنەکـە بتوانێت یەکەمجار هەستەکانی خۆی دەربڕێت، پاشان دەتوانێت بابەتیبوونیی زیاتر بـە دەست بهێنێت و ئاشـکراتر ڕۆڵـی خـۆی لـە کێشـەکەدا ببینێـت. کـاراترین ڕێگـە بـۆ ئـەو دۆزینەوەی لێبوردەیی بریتییە لـەوەی یەکـەمجار هەسـتەکانی دەربـڕێـت و پاشـان داوای

لێبوردنی لێبکرێت؛ لەو خاڵەدا، دوای دەربڕینی هەستی زیاتر، ژنەکە دەتوانێت رونتر ئەوە ببێنێت کە چۆن ئەویش لە کێشەکەدا بەشداربووە. بە گشتی ئەگەر ژنەکە ببینێت بەشداریکردنەکەی لە کێشەکەدا گەورەترە لەوەی تەنیا لە روی پاکیەوە کەسێکی هەڵەی بە هاوبەشی خۆی هەڵبژاردبێت، ئەوا بە روی هاوبەشەکەیدا دەکرێتەوە و کەپلەکە دەچنەوە لای یەکتر و خۆشەویستییەکی زیاد لە جارانیان دەبێت.

زۆر گرنگە ژن ناچار نەکرێت یەکەمجار تەماشای لایەنەکەی خۆی بکات لە کێشەکەدا. ئەمە کاریگەری خراپی دەبێت و بە بچوککردنەوە و پوچەڵکردنەوەی هەستەکانی و پشتگوێخستنی وەردەگرێت. زۆر گرنگە ژنەکە یەکەمجار هەست بە هەستەکانی خۆی بکات. دوای ئەوە، دەتوانرێت وای لێ بکرێت بابەتی بێت کە بریتییە لە گەرمی و خۆشەویستی و لێبوردەیی.

**زۆر گرنگە ژنەکە یەکەمجار هەست بە هەستەکانی خۆی بکات.**
**دوای ئەوە، دەتوانرێت وای لێ بکرێت بابەتی بێت**
**کە بریتییە لە گەرمی و خۆشەویستی و لێبوردەیی.**

کاتێك ژن تێدەگەن پیاو لە مەریخەوە هاتوە و ژنانیش لە ڤینۆسەوە، ئەزمونی لێبوردەییەکەی زیاتر دەبێت چونکە یەکەمجارە ببیستێت ناهەقی نییە وا بیردەکاتەوە و هەستەکانی رەوایەتییان هەیە. پاشان تێدەگات کە تەنیا هەر هاوسەرەکەی هەڵەی لەو جۆرەی نەکردووە، بەڵکو زۆربەی زۆری پیاوان دەکەونە هەڵەی واوە. بەم بابەتیبوونە زیاترەوە، ژن دەتوانێت لایەنەکەی خۆی لە کێشەکەدا ببینێت و لێبوردەیی زۆر زیاتر دەبێت.

## پیاوان چۆن سارێژ دەبن

بە گشتی، برینی پیاوان و ژنان وەکو یەك سارێژ نابن. ژنان بە گشتی پێویستیان بەوەیە زیاتر باسی هەستەکانیان بکەن، بەڵام پیاوان پێویستیان بە برێك کات هەیە بۆ پاشەکشەکردن تاکو بتوانن دواجار باسی هەستەکانیان بکەن. ئەوەی زیاتر لە هەمو

شتێك پیاو سارێژ دەکاتەوە ئەوەیە کە هەست بکات قوربانی نییە و تا ئاستێك دەتوانێت کێشەکە چارەسەر بکات. گەورەترین تەحەدا بۆ پیاو ئەوەیە کە بەرپرسیارێتی بەشدارییەکەی لە کێشەکەدا لە ئەستۆ بگرێت.

**گەورەترین تەحەدا بۆ پیاو ئەوەیە کە بەرپرسیارێتی بەشدارییەکەی لە کێشەکەدا لە ئەستۆ بگرێت.**

هەر کاتێك پیاو هەست بە بەرپرسیارێتی بکات، تەنانەت تا ئاستێکی دیاریکراویش بێت، ئەوا ئاسانتر دەتوانێت بارودۆخەکە بگۆڕێت. کە پیاو ئازاری پێدەگات، یەکەمجار پێویستی بەوەیە کە پاشەکشە بکات؛ پاش ماوەیەك، دوای بە دەستهێنانی بابەتیبونێکی گەورەتر، دەتوانێت بەشی خۆی لە کێشەکەدا ببینێت یاخود بزانێت چۆن دەتوانێت چارەسەری کێشەکە بکات. بەم ئاگاییەوە، دەتوانێت هەستە عاشقانەکانی بگێڕێتەوە دۆخی جارانی.

هەندێك جار پیاو بۆ دۆزینەوەی ئەو بابەتیبونە رەنگە پێویستی بەوە بێت بە شێوەیەکی کاتی لە کێشەکە دوربکەوێتەوە (پشویەك بدات، پیاسەیەك بکات، یاخود خۆی لە کارەکەیدا نقوم بکات). لە حاڵەتەکانی دیکەدا، دەتوانێت چارەسەرکارێك بدۆزێتەوە و لە رێگەی قسە کردنەوە هەستەکانی دەربڕێت. ئەگەر پیاوەکە بتوانێت هەستەکانی دەربڕێت و لێیان تێبگات و لایەنەکەی خۆی لە کێشەکەدا ببینێت، ئەوا دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆسەر خۆشەویستی و لێبوردەییەکەی جارانی.

## ژنان چۆن سارێژ دەبن

ژنانیش هەر بەم پرۆسەیەدا تێدەپەڕن بەڵام بە ریزبەندییەکی جیاواز. ژن بۆ ئەوەی بتوانێت لێبوردە بێت، سەرەتا پێویستی بەوەیە دڵنیا بێت لەوەی هەستەکانی گوێیان لێ دەگیرێت، لێیان تێدەگەن و دەسەلمێنرێن. ژن کە لێبوردەیی دەنوێنێت، دەتوانێت بگەڕێتە دواوە و بە شێوەیەکی رونتر لایەنەکەی خۆی لە کێشەکەدا ببینێت. گەورەترین تەحەدا بۆ ژن ئەوەیە واز لە توڕەییەکەی بهێنێت و لێبوردەیی بنوێنێت.

**گەورەترین تەحەدا بۆ ژن ئەوەیە**

**واز لە تورەییەکەی بهێنێت و لێبوردەیی بنوێنێت.**

ئەم پرۆسەیەی پەیوەندیکردن بە شێوەیەکی نمونەیی بە ئامادەبونی راوێژکارێکی هاوسەرگیریی راهێنراو ئەنجام دەدرێت. ئەوەی پیاو پێویستە بیزانێت ئەوەیە گرنگ نییە پیاوەکە چەندە پەشیمانە، بەڵکو بۆ ژن ئەوە ئاسانترە کە بە ئامادەبونی کەسێکی دیکە هەستەکانی دەربڕێت. ئامادەیی پیاوەکە بۆ داواکردنی یارمەتی یاخود چاوپێکەوتن لەگەڵ راوێژکاردا خۆی لە خۆیدا سارێژکردنە، چونکە ئەمە ددان بە پێویستییەکەی ژنەکەدا دەنێت بۆ پشتگیری زیاتر بۆ ئەوەی هەستەکانی خۆی دەبڕێت و ئەو پێویستییە پشتڕاست دەکاتەوە. لەم بارودۆخە بێ مەترسییەدا، ژنەکە دەتوانێت هەستەکانی زۆر بە قوڵتر دەربڕێت و پرۆسەکە کاراتر دەبێت.

## قەیرانی سارێژ بون

یەکێك لە بە ئازارترین و سەخترین ئەزمون لە هاوسەرگییدا بریتییە لە ناپاکی. لەگەڵ ئەوەشدا من سەدان کەپڵم بینیوە کە توانیویانە ئازاری ناپاکییەکە سارێژ بکەن و متمانە دروست بکەنەوە. بە یارمەتی راوێژ وەرگرتن، توانیویانە لێبوردەیی بدۆزنەوە و بگۆڕێن، کە ئەمانە بۆ دەستپێکردنەوە پێویستن، نەك لەناو تورەیی و مەراقدا سڕ ببن و بمێننەوە.

درێژی ئەو ماوەیەی کە پێویستە بۆ سارێژکردنی ئازاری ناپاکی پەیوەندی بە ماوەی درێژەکێشانی ئەو هەڵەیەوە هەیە کە ئەنجام دراوە. بۆ نمونە، ئەگەر پیاوەکە ماوەیەکی دوورودرێژ بێت پەیوەندی دەرەکی هەبوبێت، ئەوا سارێژبونەکە کاتێکی زیاتری دەوێت.

**درێژی ئەو ماوەیەی کە پێویستە بۆ سارێژکردنی**

**ئازاری ناپاکی پەیوەندی بە ماوەی درێژەکێشانی**

**ئەو هەڵەیەوە هەیە کە ئەنجام دراوە.**

تــەرخانکردنی کــاتی پێویســت بــۆ لێبــوردن و ســارێژبون دەتوانێــت ببێتــە هــۆی پەیوەندییەکی زۆر باشتر. قـەیرانی پەیوەندییـەکی دەرەکی دەتوانێت هەست و سۆزی بـەهێزی ئـەوتۆ بهێنێتـە پێشـەوە کـە کاتێك دەربـبڕدرێن و ببیسـترێن، بڕێکی گـەورەی خۆشەویستی دەردەکەوێت و کەپڵەکە دوبارە دەکەونەوە نـاو خۆشەویستی یەکترییـەوە. لەپڕ خۆشەویستییەکەیان جددیتر دەبێت؛ ئەم خۆشەویستییە کە بەرگەی قەیرانەکەی گرتــووە، خۆشەویســتییەکی راســتەقینەترە، پــڕ مانــاتر و قــوڵترە. ئــەمان کــە لــە تاقیکردنەوەکەدا دەرچون، دەسـتیان لـە خۆشەویسـتییە راسـتەقینەکە داوە و هەسـتیان پێکردووە کە خۆشەویستییەکی بەرگەگر و هەتا هەتاییە.

بیسـتنی ئـەم چـیرۆکانەی سارێژبونەوە بـە شـێوەیەکی ئۆتۆمـاتیکی ورەمـان بـەرز دەکاتــەوە، چــونکە بــە بیرمــان دەهێنێتــەوە خۆشەویســتی چــەند بــەهێزە. هیوامــان پێدەبەخشێت و یارمەتیمان دەدات ئەو شتانە بنـرخێنین کـە هـەمانن. کاتێـك دەبیـنین کەسێك بۆ کردنەوەی دڵی خۆی هەنگاوێك دەنێت، هـەمومان بـەرەو خۆشەویستییەکی گەورەتر دەجوڵێنێت. بـا تەماشـای چـەند چـیرۆکێك بکـەین لـەو سـەدان چـیرۆکەی لـەم کەپلانەم بیستووە کە لەدوای ناپاکیی لێبوردەییـان بـەدی هێنـاوە و بـەردەوام بـون لـە گەشە کردن لە خۆشەویستیدا.

**(لیسا) و (ستیڤن)**

(لیسـا) چـیرۆکەکەی خـۆی گێڕایـەوە. "مـن و (سـتیڤن) ماوەیـەکی دورودرێـژ بـو پێکـەوە دەژیـاین — نزیکـەی هەشـت سـاڵ بـو پێکـەوە دەژیـاین - بـەڵام هـەردوکمان دەترسـاین لـەوەی پابەنـدی دروسـت بکـەین و هاوسـەرگیری بکـەین. بۆچـی؟ چـونکە هەردووکمان لە شکست دەترساین، وابزانم. من لە خێزانێکەوە هاتبوم هـەمو خوشـك و براکـانم هاوسـەرگیرییان کردبـو پاشـان لـە هاوسـەرەکانیان جیابوبونـەوە. (سـتیڤن)یش پێشـتر هاوسـەرگیرییەکی کردبـو، بـەڵام ئەوکاتـە زۆر منـاڵتر بـو. بـۆ هـەردوکمان وا بێمەترسـیتر بـو کـە تـەنیا پێکـەوە بـژین نـەك مەترسـی شکسـت بگرینـە بـەر، و ئـەو پابەندییە هەتا هەتاییە ترسناکە دروست بکەین.

بــەڵام ئێمــە دەســتمان کــرد بــە بەشــداریکرن لــە ســیمینارەکانی (جــۆن گــرەی) و

گوێگرتن لە کاسێتەکانی - و ئەو هەستە هاتە پێشەوە کە ڕەنگە بتوانین سەرکەوتو بین، لەبەرئەوەی چەند ئامرازێکمان پێدەبێت لە کاتە سەختەکاندا بەکاریان بهێنین. ئێمە هێشتا دەترساین، بەڵام قسەمان لە بارەوە دەکردو لەسەری دەڕۆیشتین. پاشان لەراستیدا ڕێك کەوتین و کاتێکمان دەستنیشانکرد بۆ ئاهەنگەکە. بەڵام ئەوەی نەمدەزانی ئەوە بو کە (ستیڤ) لە من زیاتر دەترسا.

ڕۆژێکیان (ستیڤن) پێی وتم (شتێك هەیە پێویستە قسەی لەسەر بکەین). بەڕاستی دەگریا، و زانیم بابەتەکە هەرچییەك بێت بابەتێکی گەورەیە. مێشکم شێوا- وام زانی کەسێك مردووە.

وتی: (سەیرکە (لیسا)، من شتێکی زۆر نەگونجاوم کردووە.) دواتر پێی گوتم کە پەیوەندییەکی دەرەکی ئەنجام داوە.

ئەو بە تەواوی پەشیمان بو، بەرپرسیارێتی ١٠٠٪ی ئەو کارەی کردبوی گرتییە ئەستۆی خۆی. بە تەواوی پێوەی دیاربو کە هەستێکی زۆر ناخۆشی هەیە بەرامبەر بەو کارە. و پێی گوتم (نازانم چی بکەم.)

ئەوە شتێکی تەواو چاوەڕواننەکراو بو بۆ من. بیرمە - پێشتر ماوەیەك هەستم بە دورکەوتنەوە کردبو، بەڵام نەمدەزانی مەسەلە چییە. کاتێك ئاوڕم دایەوە، بینیم کە پێشتر هەستم کردبو شتێك ڕودەدات، بەڵام بەراستی متمانەم بەم (هەستە)ی خۆم نەکردبو.

دواجار کەوتینە گریان. هەردوکیشمان، من دڵنیام لەوە، بیرمان لە ئاهەنگی هاوسەرگیرییەکەمان دەکردەوە. (ستیڤ) پێی گوتم کە هەستی کردووە دەبێت ڕاستگۆ بێت لەگەڵمدا و ئەو بڕاردەیە بخاتە بەردەمم کە ئاهەنگەکە پوچەڵ بکەینەوە. پێویستە ددان بەوەدا بنێم، خۆیشم ئەوەم بە مێشکدا هاتبو. من تورە و ناڕەحەت و بریندار بوم - بەڵام لەو خاڵەدا هێشتا بە تەواوی دڵنیا بوم کە دەمویست هاوسەرگیری لەگەڵ (ستیڤ)دا بکەم.

تا ئەو کاتە، ئێمە بەشداری دوو سیمیناری (جۆن)مان کردبو، هەروەها ڕاوێژی تایبەتمان لە (جۆن) وەردەگرت. من دڵنیام کە (ستیڤ) بوێرییەکەی لەوەوە وەرگرتووە کە باسی پەیوەندییە دەرەکییەکەی بکات. ئەو لە هەمو کاتێك زیاتر کامڵ و دڵدار بو خۆشویستنی و نەیدەویست ژیانێکی درۆی هەبێت. بە بڕوای من (ستیڤ)

کاتێك (جۆن گرەی) بینیوە چەند دەربارەی ژیانی خۆی راستگۆیە و پێوەرەکانی چەند بەرزن و چەند کەسێکی کامڵە، ئەو شتانەی لێوەرگرتووە. بڕواناکەم ئەگەر ئەم شتانەی ئەزمون نەکردایە ئەو پەیوەندییە دەرەکییەی بۆ باس بکردمایە.

بەلاّم ئێستا، دوای سیمینارەکان، هەردوکمان کەرەسەی پێویستمان پێبوو بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ قەیراندا. ئەمە پێکەنیناوییە، بەلاّم تێپەڕبون بەم گەڕانەدا هێندەش سەخت نەبو. پێویستم بەوە بو پرسیاری زۆر بکەم: بۆ کوێ چویت؟ کەی لەگەڵی نوستیت؟ چەند جار؟ ئەو چ جۆرە کەسێك بو؟ و رۆژ بە رۆژ قسەمان دەکرد. تێپەڕبون بەمەدا پرۆسەیەکی درێژخایەن بوو.

من بە بەکارهێنانی نامەی خۆشەویستی هەستەکانم نوسییەوە، و دام بە (ستیڤ)و وەلاّمەکەیم لێوەرگرت. و بڕوام پێبکەن، ئەوە زۆر زۆر سارێژی کرد، لەبەرئەوەی نوسینی هەستەکانم زۆر بە ئاگای هێنامەوە لەو خۆشەویستییەی لە ژێر توڕەیی و ترسەکەمدا بو.

هەروەها سودیشی هەبو بۆ تێگەیشتن لە جیاوازییەکانی نێوان پیاوان و ژنان. ئێمە هەریەکەمان فێربوین ئەو شتە نەبەخشین کە خۆمان دەمانویست وەریبگرین؛ لەبری ئەوە ئێمە دەمانزانی چۆن ئەو شتە ببەخشین کە ئەوی دیکە پێویستی پێیەتی و دەیەوێت. ئێمە تێگەیشتین لەوەی بەخشینی خۆشەویستی بۆ هەریەکەمان جیاوازە، و پێموایە ئەم زانیارییە یارمەتیداین تێبگەین کە پێویستە چۆن لەگەڵ یەکتریدا بین. بەبێ ئەو زانیارییە باوەڕناکەم بمانتوانیایە سارێژ ببینەوە.

**ئەوەی یارمەتی دام کە بەتەواوی لە (ستیڤ) ببورم**
**ئەوەبو کە دەمزانی ئەو گۆڕاوە.**

شتێکی دیکە کە یارمەتیدام بەتەواوی لە (ستیڤ) ببورم ئەوە بو دەمزانی ئەو گۆڕاوە. ئەو چەند مانگێك بو وازی لە بینینی ئەو ژنە هێنابو، و ئێستا زانیاری نوێ و ئامرازی نوێ و تەنانەت رێکاری نوێی هەبو بۆ ژیان: ئیتر بە ئاگاییەوە دەژیا. بەم جۆرە من توانیم لەو ماوە کەمەدا متمانەی پێبکەم، و بەراستی لێی ببورم. ئەوە چاوەڕواننەکراو بو

بۆم کە ئەم شتە زۆر بە نـەرمی تێپـەڕی، بـەڵام ئێستا بیری لێ دەکەمـەوە بـۆم دەردەکـەوێت بەشێك لەو شتە پەیوەندی بە قسەیەکەوە هەبو کە ئەو پێی گوتم.

ئەو گـوتی (مـن بەراسـتی وام بیرکـردەوە کـە بـەجێت بهێڵم (لیسا) و لەگـەڵ ئـەودا بڕۆم.) بەڵام شتی وای نەکرد. منـی هەڵبـژارد و وازی لـەو هێنـابو. ئـەوە نیشانی دام کـە بەراستی خۆشی دەوێم و بایەخم پێ دەدات.

چەند مانگێك دوای ئەوە، ئێمە هاوسەرگیریمان کرد و ئەوەش ئەزمونێکی تەواو بـێ کەم‌وکوڕی بو. کـەش و هەواکـە زۆر خـۆش بـو، شـوێنەکە زۆر جـوان بـو، ئێمـە لـە ژێـر ئەسـتێرەکاندا لەسـەر تاشـەبەردێکی سـەر زەریاکـەدا سـەمامان کـرد. ئـەوە ئێوارەیـەکی ڕۆمانسی بێ کەم و کوڕی بو.

ئێمـە ئێسـتاش ڕۆمانسـیمان بـەلاوە گرنگـە؛ ئێمـە هـەردوکمان بـە سروشـت زۆر ڕۆمانسین. بەڵام ئێستا ئێمە کوڕێکی دوو ساڵمان هەیـە کـە مـەریخییـەکی زۆر چالاکە. بۆیە کەمێك سەختترە ژیانێکی تەواو ڕۆمانسییانـەمان هـەبێت، بـەڵام شتە بچوکەکان گۆڕانکـاری گـەورە دروسـت دەکـەن. (سـتیڤن) زۆرجـار گـوڵم بـۆ دەهێنێتـەوە، و کاتێـك دەگەڕێتەوە ماڵێ، پـێش ئـەوەی بچێت بـەلای پـەیام و پۆسـتەکانەوە، دێـت بـۆ لای مـن. تەلـەفون دەکـات تـەنیا بـۆ سـڵاو کـردن، تەنانـەت ئەگـەر زۆر سـەرقاڵیش بێـت. شـتە بچوکەکان: بیرم دەخەنەوە کە ئەو چەند منی بەلاوە گرنگە.

---

**زۆر سەرنجڕاکێشە کە ئەم شێوازەی مامەڵەکردن**
**لەم تەمەنە منالەیدا نیشانی (دۆنۆڤان) دەدەین.**

---

من زۆر دڵخۆشم کە شارەزایی پەیوەنـدی ئـەرێنی و خۆشەویستانەمان هەیـە، نـەك تەنیا لەبەر خۆمان بەڵکو بۆ (دۆنۆڤان) ی کوڕیشمان. پـێش ئـەوەی ئێمـە ڕاهێنانەکـەی (جۆن) وەربگرین زۆر دەمانقیژاند، (ستیڤ) پاشەکشەی دەکرد و منیش دەشڵەژام. ئایـا لێـرەدا ئێمــە شــەڕمانە و ئــەو دەڕوات بــەجێم دەهێڵێــت؟ ئێمــە ئێســتا زۆر ئــەرێنی، خۆشەویستانە و کراوە شارەزای پەیوەندییکردنمان هەیە و دیارە ئەمـەش زۆر سەرنجڕاکێشە کە ئەم شێوازەی مامەڵەکردن لەم تەمەنە منالەیدا نیشانی (دۆنۆڤان) دەدەین.

من و (ستیف) هەردوكمان قایلین بەوەی كە ئەم ژیانەی ئێستامان نەدەبو ئەگەر (جۆن گرەی) مان نەبینیایە - ئێمە هاوسەرگیریمان نەدەكرد و منداڵمان نەدەبو. (جۆن) راست بو لەگەڵماندا، و ئێمە شتی وای لێ فێربوین كە یەكسەر بەكارمان هێنان. ئێمە هەردووكمان بڕوامان وایە كە بە شێوەیەكی سەرسوڕهێنەر بەختەوەرین: ئێمە كراوە بوین و حەزماندەكرد و پێویستمان پێبو فێرببین... و (جۆن)یش رێك لەوێدا ئامادەبو بۆمان، رێك لە خاڵی هەڵگەڕانەوەكەدا.

**(جێری) و (مات)**

(جێری) باسی سارێژبونی هاوسەرگیرییەكەی كرد: لە رۆژی ١٨ی كانونی دووەمی ١٩٩٠، من لە ژنێكی نەناسراوەوە تەلەفونێكم بۆ هات. ژنەكە گوتی (هاوسەرەكەت ماوەیەكە ژنێك دەبینێت و منداڵێكیشی هەیە...) تەلەفونەكەم داخست و بە هاوسەرەكەمم وت كە لەوێدا دانیشتبو. لە سەرەتادا هەمو شتەكەی رەت كردەوە. دواتر، چومە جێگاكەوە و لە دڵی خۆمدا گوتم (ئەگەر منداڵی هەبێت ئەوا نابەخشرێت.) هێشتا هیوام دەخواست پەیوەندییەكە تەنیا كەسێكی بێزاركەر كردبێتی.

دواجار هاوسەرەكەم بوێری ئەوەی بە دەست هێنا كە پێم بڵێت ئەو شتەی پێم گوترابو راستە. لەبیرمە دڵم تێكەڵ هات و بە پەلە رامكردە توالێتەكە. پاشان چوین بۆ ژوری دانیشتنەكە و دەستمان كرد بە قسە كردن. من بەراستی سەرسام بوم كە هەستم بە خۆشەویستییەكی چەند زۆر دەكرد بۆ ئەم پیاوە لە دوای ئەوەی ئەم دانپیانانە ناخۆشەم لێ بیست. من هەمیشە وام دەزانی ئەگەر هاوسەرەكەم ناپاكیم لێبكات، ئەوا دەستبەجێ هاوسەرگیرییەكەمان كۆتایی دێت، بەڵام بە هیچ شێوەیەك كاردانەوەم وا نەبو.

ئەو پێی گوتم كە پەیوەندییە دەرەكییەكە سێ ساڵ لەمەوبەر دەستی پێكردبو، و پاشان نزیكی جەستەیی ساڵێك دوای ئەوە كۆتایی هاتووە، كاتێك بۆی دەركەوتووە كە ئەو ژنە دووگیانە. نەگبەتی، منیش ماوەیەكی كەم دوای ئەو ژنە دووگیان بوبوم، كەواتە بیركردنەوە لەوەی پێویستە ئەو كاتە پێی بگوتمایە هەڵە بوو. هاوسەرەكەم بەو نهێنییەوە دەژیا كە دوو كوڕی هەبو: (پاتریك) كوڕەكەی ئێمە و (جەیسن) كوڕی ژنەكەی دیكە. لە دایكبونی هەردوكیان شەش هەفتە لە نێوانیاندابو. لە ماوەی یەك

ساڵی تەمەنی (جەیسن) دا، هاوسەرەکەم بە دەگمەن دانی پێدانابو، بەڵام بەم دوایی‌یە (مات) مافی ئەوەی درابویە کە بگەڕێتەوە بۆ ناو ژیانی (جەیسن). کە من مەسەلەکەم بۆم دەرکەوت، هاوسەرەکەم خەریکبو پیّی ئاشنا دەبو.

هاوسەرەکەم دڵنیای کردمەوە کە پەیوەندییەکەی لەگەڵ ژنەکەی دیکەدا کۆتایی هاتووە و ئێستا تەنیا هاوڕێن لەبەر خاتری (جەیسن). لە بیرمە هەستم بە سەرسوڕمان کرد دڵنیام کردەوە و پێم گوت دەمەوێت بمێنێتەوە، بە خۆمم گوت، ئەو بۆچی وا دەزانیت کە من داوای لێ دەکەمماڵەکە بەجیّبهێڵێت؟

لەگەڵ ئەوەشدا لە مانگەکانی دواتردا، من بەراستی بیرکردنەوەی خۆمم خستە ژێر پرسیارەوە، لەبەرئەوەی کاردانەوەکەم بەو جۆرە نەبو کە وام دەزانی کەسێك لەو بارودۆخەی مندا دەبێت ئەو جۆرە کاردانەوەیەی هەبێت. من تەنیا دەتوانم قبوڵکردنم بۆ ئەو بارودۆخە بخەمە پاڵ ئەو راستییەی کە کورەکەم برایەکی هەیە. هەروەها (جەیسن) لایەنێکی بێتاوان بو لەم کابوسەدا و پێویست نەبو ئازار بدرێت. من خەوم بینی کە دەتوانم لە هاوسەرەکەم ببورم و دەتوانم (جەیسن) بهێنینە خێزانەکەمانەوە و ئیتر بە دڵخۆشی بژین. زۆر زەحمەت بو ئەم خەونە بهێنێتە دی - بەڵام بەهۆی (جەیسن)ەوە نا.

کاتێك من بەم بابەتەم زانی، من و (مات) نزیکی هەشت ساڵ بو هاوسەرگیرییمان کردبو. ئێمە چەند کێشەیەکمان توش بوبو - ناکۆکی لە کار و شێوازی داهاتەکان، ناکۆکی سەبارەت بەوەی ئایا خانو بکڕین یان نا، و ئەو هەستەش کە پەیوەندییەکەمان خۆشییەکەی جارانی تیا نەماوە — و پەیوەندییەکەمان لە بارێکی خراپدا بو. ئێمە دەستمان کردبو بە سەردانی راوێژکار و شەش مانگ پێش ئەم ئاشکرابونە چوبوینە لای راوێژکارێکی نوێ. من دەمپرسی ئەم پیاوەی کە ئەوەندە خۆشم دەوێت ئایا منی تێپەڕاندووە و من بە سەرنجراکێش نازانێت. نەمدەزانی کە ئەو نهێنییە بارێکی هێندە گران بووە بەسەرشانییەوە و پەیوەندی بە منەوە نەبووە!

سەرسوڕمان لەگەڵ رەتکردنەوەدایە. تۆ تەنیا لەبەرئەوە بەرامبەرەکەت رەت دەکەیتەوە کە راستییەکە هێندە سەرسوڕهێنەر بێت بڕوای پیّنەکرێت. بەلای منەوە، رەتکردنەوەکە ئەو بیرکردنەوانەی لێ دورخستمەوە کە هاوسەرەکەم لە ژنێکی دیکە نزیك بوبێتەوە چونکە دەگەڕایەوە ماڵەوە بۆ لام. لە بیرمە وام بیرکردەوە ئەمە

هەڵەیـەکی رابـردووە، تەنانـەت کـاتێکیش کـە بـەردەوام وێنەیـەکی ئـەو و ژنەکـە لـە مێشکمدا دەردەکەوتن.

وا دەزانم واز لـە یـەکترهێنان بـۆ (مـات) سـەختتر بـو وەك بـۆ مـن. ئـەو هەسـتی بـە شـەرمەزارییەکی زۆر دەکـرد و قایـل بوبـو کـە تـەنیا باسـکردن لـە بارودۆخەکـە بـەس نـیـیە. ئەو نیگەران بو کە هەمو ئـەو شـتانەی وێـران کـردووە کـە هـەمانبون و زیانەکـە ئەوەندە گەورەیە کە چـەند سـاڵێکی پێدەچێت تـا چـاك دەکرێتـەوە — ئەگـەر ئەسـڵەن هـەر چـاك بکرێتـەوە. ئایـا ئەوەنـدە (خۆشەویسـتی گەوهـەری) هـەبو لـە نێوانمانـدا کـە بتوانین بەردەوام بین؟

زۆرجـار ناکۆکییـەکان بـەلای هەردوکمانـەوە زۆر سـەخت بـون، تەنانـەت جارێکیـان وتمان هەریەکـەمان رێگـەی جیـاوازی خـۆی بگرێتەبـەر. بـەڵام هـەردووکمان بڕیارمانـدا بمێنینەوە، هەرچەندە ئازار و خەفەتەکە هێندە گەورە بون کە وا دەرکـەوت جیابونـەوە ئاسودەمان بکات. من نەمدەتوانی بەبێ هەست و سۆز پەیوەنـدی لەگـەڵ (مـات)دا بکـەم، و ئەویش زیاتر دەچووەوە ناو خۆی. هێشتا، ئێمـە لـەم قەیرانـەدا دەمـانزانی کـە ئێمـە یـەکتریمان خـۆش دەوێـت و توانیمـان ددان بـەوەدا بنـێین. ئێسـتا ئـاوڕ بـۆ ئـەو کاتانـە دەدەمـــەوە و بـــۆم دەردەکـــەوێت کـــە ئێمـــە بەراســـتی بـــە شـــێوەیەکی زۆر (مـــەریخی و ڤینۆسـی) پەیوەنـدییمان دەکـرد و هـەوڵمان دەدا لەگـەڵ کارەکـەمان، لەگـەڵ یـەکتر و لەگەڵ کوڕەکەماندا ئاسایی رەفتار بکەین.

**ئایا ئەوەندە (خۆشەویستی گەوهەری) هەبو**
**لە نێوانماندا کە بتوانین بەردەوام بین؟**

بۆ تێپەڕاندنی ئەم قەیرانـە ئێمـە چـەندین رێگـەی جیاوازمـان گرتەبـەر. مـن چـاوم بـە (جەیسـن) کـەوت و بـۆم دەرکـەوت کـە خوشـکێکی هەیـە بـە نـاوی (جێنیڤـەر) کـە بـاوکی بـەجێی هێشـتووە. هەسـتێکی زۆر بـەهێزم بـۆ دروسـت بـو بـۆ پاراسـتنی ئـەو منالانـە، تـا دڵنیابم لەوەی کە ئەو منالانە ئازار نادرێن و بزانن کە خۆشەویستی دایك و باوکیـان بۆیـان بێقەید و مەرجە. بەڵام منیش نارەحەت بوم - و بە دڵنیاییەوە (مات)یش بەهەمان شێوە.

کاتێك بەهۆی پەیوەندییەكی دەرەكییەوە منالێك دروست دەبێت، (ژنەكەی دیكە) هەر ئامادەیە. ئەوە پەیوەندییەك نىیە بتوانرێت بە ئاسانی فەرامۆش بكرێت، چونكە ئەگەر باوكەكە بیەوێت منالەكە ببینێت پێویستە هەڵسوكەوت لەگەڵ ئەو ژنەدا بكات. بۆیە پرۆسەی سارێژبونەوەكەم لە سارێژبونەوەی ئاسایی سەختتر بو. من زۆرجار بیر لەو ژنانەی دیكە دەكەمەوە كە بەمەدا تێپەڕیون؛ من قسەم لەگەڵ ئەو ژنانەدا كردووە، بەلام هیچ كام لەو حالەتانە منالی تێدانەبووە.

من بەراستی وام بیركردەوە كە ئەگەر لە بارودۆخەكە دوور نەكەومەوە شەق دەبم، و چارەسەركارەكە پێشنیاری كرد (لەیەك دووربكەوینەوە)، بۆ ماوەیەكی دیاریكراو بەو بەڵێنەوەی كە هیچ بڕیارێك سەبارەت بە جیابونەوە نەدەین.

دوای دووركەوتنەوەكە، ئێمە یەكەم گەشتی خێزانییمان پێكەوە ئەنجامدا، و سەیر ئەوەیە توشی خەمۆكی بومەوە. ئەوە یەكەمجار بو دوای ماوەیەكی زۆر لەگەڵ (مات) و (پاتریك)دا بە تەنیابم، و لەوێ هیچ شتێكی لێنەبو سەرنجم رابكێشێت. هەمو نیگەرانییەكان هوروژمیان بۆ هێنامەوە.

بە دوودڵییەوە خۆمان ئامادەكرد دەستبكەینەوە بە سەردانی راوێژكار، بەلام نزیكەی هەفتەیەك پێش وادە دیاریكراوەكەمان، (مات) بە بلیتی سیمینارەكەی (جۆن گرەی) سەرسامی كردم.

چ سیمینارێك بو! زۆر سەرسوڕهێنەر بو كە زانیم پیاوان و ژنان جیاواز لە یەكتر بیردەكەنەوە، و لە سەرتاپای ژوورەكەدا هەستت بە ددانپیانان دەكرد بەرامبەر بەو بیرۆكەیە. هێواش هێواش بۆم دەركەوت گرنگ نییە من و (مات) چەند باس لە كێشەكە دەكەین. گرنگ ئەوەیە لەوشتە تێبگەین كە دەگوترێت.

چ ئاسودەییەك بو بۆ هەردوكمان - ئاشكرایە بۆ ئامادەبوانی دیكەی سیمینارەكەش. زۆربەی ئەو خالانەی (د. گرەی) باسی دەكردن جۆرە ئاسودەیییەكی دەبەخشی، چونكە باسی ئەوەی دەكرد چۆن دەتوانین باشتر لە هاوبەشەكەمان تێبگەین و بەمەش هەست بە ئاسایش بكەین چونكە ئێمە لەگەڵ كەسێكی غەریبەدا ناژین.

(د. گرەی) سەبارەت بەوەی چۆن داوای ئەو شتە بكەین كە دەمانەوێت و نمونەی

گاڵتـەئامێزی دەهێنایـەوە یارمـەتی هـەمومانیدا کـە شـتێکی نـامۆ نـییـە (کێشـەی پەیوەندییکردن)ت هـەبێت لەگەڵ هاوبەشـەکەتدا. تـرس لـە داواکـردن، بـە تایبـەتی لـە بواری سێکسیدا، چەندین ساڵ بو لای ئێمە هـەبو. (د. گـرەی) بـە رادەیـەکی زۆر لـەوەدا روون بو کە ژنان و پیاوان چیان دەوێت و چییـان ناوێت، و ئـەو شـێوازە گاڵتـەئامێزە سەرنجڕاکێشەی بەکاری دەهێنا بە شـێوەیەکی زۆر گـەورە یارمـەتیدایـن. کـە شـێوازێکی گاڵتەئامێزی سەرنجڕاکێشی بـەکاردەهێنا. ئـەو دڵنیـای کردینـەوە کـە دەکرێت هـەردوو هاوسەرەکە هەڵەبکەن و دەشیکەن، بەڵام دەتوانرێت پەیوەنییەکان باشتر بکرێن!

من و (مات) بە ئاگاییەکی نوێوە لەبارەی یەکترەوە سیمینارەکەمان بەجێ هێشت. لەم خاڵەدا، ئێمە دەمانزانی بەراستی یەکترییمان خۆش دەوێت بـەڵام هەست و سۆزمان بەهۆی ترسە کۆنەکانمانەوە جلەوکراوە. ئەو رۆژە بە (مات)م گوت دەتـوانم پەیوەندییـە دەرەکییەکە تێبپەڕێنم و دەمەوێت تەنیا هەر پێکەوە بـەردەوام بـین. (مـات) سەرسـام بـو بـەو ئێـوارە (پێکـەوە)یـیـە تایبەتـە کـە بەراسـتی سـەرنجڕاکێش بـو! (د. گـرەی) راسـت دەکات: بەرنامە دارشتن بۆ ئێوارەی (پێکەوەیی) دەستپێشخەرییەکی مەزن دابین دەکات.

من بەوە کۆتایی ناهێنم بڵێم (ئینجا ژیـانێکی خۆشـیان بردەسـەر)، چونکە هێشتا لـە رێگەکەدا توشی لەمپەڕ دەبین بەڵام دەتوانم بڵێم کە ئێستا دەمەوێت کاتـەکانی پێکـەوەیی من و (مـات) بکەم بـە یەکـەم ریزبەنـدی، و لـەم قسـەیەدا هەسـت بـە خۆپەرسـتی ناکـەم. ئێمە هەردوکمان دەزانین کە ئەمەش بە ئەندازەی گەورەکردنی مناڵەکەمان گرنگە.

سوپاسی (د. گرەی) دەکەم سەبارەت بە راشکاوییەکەی لـەبارەی ئـەو بـوارە سـادانەوە کە بەگشتی باسیان لێوە نەکراوە - تەنانەت لە نێوان پیاوان و لەنێوان ژناندا.

**(جولی) و (لاری)**

(جولی) چیرۆکەکەی خۆی لەگەڵ (لاری)دا گێڕایەوە: نـاوم (جـولی ئـان)ە؛ هاوسـەرەکەم ناوی (لاری)یـە. تەمـەنم بیسـت و پێـنج سـاڵە و (لاری) بیسـت و شـەش سـاڵە. پێـنج سـاڵە هاوسەرگیریمان کردووە و حەوت ساڵە یەکتر دەناسین. کوڕێکی پێنج ساڵیشمان هەیە.

ئەمە چیرۆکەکەمانە.

تەمـەنم نزیکـەی نـۆزدە سـاڵ بـو کـە یـەکتریمان بینـی و زۆر بـەخێرایی کەوتمـە

خۆشەویستییەوە. ئەوکاتەی یەکترمان بینی، پێنج ساڵ بو من لەگەڵ کوڕێکدا ژوانم دەبەست. (لاری) کوڕێکی قژدرێژی خاوەن سترێۆیەکی دەنگ بەرزی بو. دایك و باوکم رقیان لێی بو! لەبەرئەوەی دایك و باوکم ئەویان قبوڵ نەبو، تەنیا چوار مانگ دوای ئەوە رامانکرد بۆ (نیومەکسیکۆ) کە لەوێ دایکە راستەقینەکەم دەژیا (چونکە من هەڵگیراومەتەوە).

ئەوە کارێکی کەمێك شێتانە بو، بۆیە گەڕاینەوە بۆ (تۆپێکا)، شارەکەمان، کە لەوێ بۆمان دەرکەوت من دووگیانم. دوای ئەوە من لای دایك و باوکی خۆم ژیام و (لاری) لای دایك و باوکی خۆی. شتێکی سەخت بو.

ماوەیەکی کەم دوای لەدایکبونی (جۆش)، من و (لاری) هاوسەرگیرییمان کرد و زۆر دڵخۆش بوین. تاکە کێشەمان پارە بو، (لاری) فرۆشیاری ئوتومبیل بو، پێویست بو زۆر کار بکات. (لاری) بڕیاریدا کە پێویستە بچین بۆ (کانساس سیتی) گوایە لەوێ هەلی زیاتر و باشتری کارکردن هەیە. ئەو رۆیشت و منیش بەدوایدا چوم، بەڵام زۆر لێی پەستبوم کە لە شارەکەمم دوردەخاتەوە. ئەو کاتە کێشەکانمان دەستیان پێکرد.

ورده ورده قسه کردنمان کەم کردەوە، سێکس کردنمان کەم کردەوە و شتمان بۆ یەکتر باس نەدەکرد. رقمان لەو شوقەیە بو کە تیایدا دەژیاین، و لە ناوەڕاستی شتەکاندا بڕیارماندا خانویەك بکڕین. بەراستی هەمو شتێك بەرەو نەمان دەچو.

ئێمە لە خانووەکەدا زۆر خۆمان ماندو دەکرد و جوانمان کرد، بەڵام منداڵێکی چوار ساڵمان هەبو کە لەبەر شەقامەکە نەیدەتوانی بچێتە دەرەوە یاری بکات و ژنێکی تەنیاش هەبو لەبەرئەوەی هاوسەرەکەی هەمو شەوێك تا کاتژمێر دەی شەو کاری دەکرد. ئەوە سەخت بو. ئێمە دو کەسی غەریبە بوین پێکەوە دەژیاین - دو هاوژور بوین، زۆرجار ئەمەم دەوت.

ئینجا ئەوە رویدا. پیاوێك کە دەمناسی دەستی کرد بە موجامەلەکردنم کە من چەند جوانم - هەمو ئەو شتانەی دەمویست لە (هاوژور)ەکەمی ببیستم و هەرگیز پێی نەدەگوتم. من توامەوە. ئەمە وای لێکردم بیرم بکەوێتەوە کە من کەسێکی چل ساڵان نیم لە جەستەیەکی بیست ساڵاندا گیرم خواردبێت.

ئەوە زۆر خۆش بو هەست بە گەنجێتی و سەرنجڕاکێشی بکەیت. کاتێك قسەم بۆ

ئەم پیاوە دەکرد هەمو کێشەکانی ماڵەوەم بیردەچۆوە کە دەبو کاریان لەسەر بکەم.

جیابونــەوەم دەویســت. ئیرەیــیم بــەو هاوڕێیانــەم دەبــرد کــە لــە هاوســەرەکانیان جیابوبونەوە. ژیانیان بەراستی باش دەهاتە بەرچاوم و وام هەست کرد کە لە ئێستاوە سەڵتم!

لای من (لاری) تەنیا غەریبەیەك بو کە لە جێگاکەمدا دەنوست و بەتانیەکەی منـی بەکاردەهێنا. هەر ئەوە بو. دەبو شتێکی دیکە هەبێت (هەمو گۆرانـیـیەکانی (کەنتری) بۆ من دەگونجێن!).

لەهەمان کاتدا، هاوسەرەکەم لە شوێنی کارەکەی ئاشنایەتی لەگەڵ ژنێکدا پەیدا کردبو. هەمان ئەو هەستە ترسناکەی هەبووە کە من هەمبو. ئەو ژنە هەمان شتی بەسەر ئەودا هێنابو کە پیاوەکە بەسەر منیدا هێنابو- وای لێ کردبو دووبارە هەست بە سەرنجڕاکێشی بکات. هەستێکی زۆر خۆشی بۆ دروست بوبو کە حەزی لێ دەکرێت.

کاتێك هەمو ئەمانە ئاشکرا بوون، ئێمە لە (تۆپێکا) لە ئوتومبیلەکەدا دانیشتبوین. ڕاستگۆییەکی زۆر هەبو، دەستگرتن، گریان و تەنانەت ختوکەدانێکی باشیش، کە ئێمە زۆرجار دەمانکرد. دەمانزانی کە دەبێت سەرلەنوێ دەست پێبکەینەوە، بە تەواوی دەست پێبکەینەوە.

بەڵام ئێمە وەکو تیپێك یەکمان گرتەوە و من دەستم کرد بە خوێندنەوەی کتێبەکانی تۆ. هەمو بڕگەکانی کتێبەکە کە توانیبێتم بۆ (لاری)م خوێندۆتەوە و ئەویش زۆر بەسەبر بووە لەگەڵمدا، بە ماڵەکەدا دوای دەکەوتم و دەمخوێندەوە!

من زۆر شت لەو کتێبانەوە فێر بوم. دەستم کرد بە خۆجوانکردنی زیاتر بۆ (لاری). ئەو کاتەی بمانتوانیایە چاودێرێك بۆ منداڵەکانمان بدۆزینەوە، کە هەوڵمان دەدا زیاتر لە جاران ئەم کارە بکەین، دەچوین بۆ شوێن دەگەڕاین (ئوتومبیلەکەمانی لێ ڕابگرین.) ئەمە شتێکی خۆشە - خۆشی و سەرکێشی زۆر چێژ دەبەخشن. زیاتر پێکەوە دەچوینە حەمام، و سکاڵام نەدەکرد کە کێ هەمو جارێ ئاوە گەرمەکەی بەردەکەوێت!

**ڕاستگۆییەکی زۆر هەبو، دەستگرتن، گریان و تەنانەت**
**ختوکەدانێکی باشیش، کە ئێمە زۆرجار دەمانکرد. دەمانزانی**

**کە دەبێت سەرلەنوێ دەست پێبکەینەوە، بە تەواوی دەست پێبکەینەوە.**

(لاری) ئێستاش رۆژانە چەند کاتژمێرێکی دورودرێژ کار دەکات، بەڵام من هەوڵ دەدەم خۆم بەماڵەکە و بە منداڵە پێنج ساڵەکەمەوە سەرقاڵ بکەم. پاشان، کاتێک (لاری) دەگاتەوە ماڵێ، لەبری ئەوەی تەماشای کاتژمێرەکە بکەم، هەوڵ دەدەم بە زەردەخەنەوە پێشوازیی بکەم. یەکەم شت یەکتر ماچ دەکەین و پاشان قسە دەکەین. هەمو شەوێك. زیاتریش لە ماڵەوە دەمێنینەوە، وەك لەوەی لەگەڵ هاورێکانماندا بە جیاجیا بچینە دەرەوە. ئێمە ئێستا وا هەست دەکەین کە یەك کەسین! کاتێکیش دەچینە دەرەوە بەراستی پێکەوەین. ئەمە هەستێکی جوانە.

ئێمە ماوەیەك پێش ئێستا حەوت ساڵ بەسەر یەکتر ناسینماندا تێپەری. ئەمە سەخت بووە. بەڵام هەمو بەشێکی وانەیەك بووە فێری بوین، و هەمو رۆژێك رۆژێکی نوێ بووە لەبەردەممانـدا. من زۆر سوپاسگوزارم سەبارەت بەو هەمو شتانەی فێریان بوین و بەرامبەر بەوەی چەند لە خۆشەویستیدا گەشەمان کردووە.

**(جان) و (دەیڤد)**

(جان) ئەمەی گێرایەوە، من و (دەیڤد) لەوکاتەوەی نۆ ساڵ و یانزە ساڵ بوین یەکتر دەناسین. کە بوین بە پانزە و حەڤدە ساڵ، دەستمان کرد بە ژوان بەستن. هیچ کاممان پێشتر لەگەڵ کەسی دیکەدا ژوانمان نەبەستبو.

ئەوەی سەرنجی منی بەلای (دەیڤد)دا راکێشابو قۆشمەچێتییەکەی، هێمنییەکەی، هاوسۆزییەکەی و جێی متمانەبونەکەی بو. دەستکراوەیی و بیرمەندییەکەی سەبارەت بە خەڵکی دیکە گرنگ بون، هەروەها بایەخ پێدان و خەمخۆرییەکەیم لەلا گرنگ بووە. پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ دایك و باوکم و خێزانەکەمدا هەبو. کات بەسەربردن لەگەڵیدا خۆش بو، من هەستم دەکرد تایبەتم و خۆشەویستم. ئێمە هەمان حەزمان هەبو لە مۆسیقادا و چێژمان دەبینی لەوەی لە هەلێکدا بتوانین لە دەرفەتێکدا یەکتر ببینین. ئێمە پێنج ساڵ پێکەوە بوین و دواتر لە ساڵی ١٩٦٩ هاوسەرگیرییمان کرد.

بە درێژایی سی ساڵ، باشترین کاتی پەیوەندییەکەمان ئەم دڵخۆشییەیە کە ئێستا هەمانە. ئاسودەییەکەی ئێستامان بەجۆرێکە کە هەرگیز پێشتر لەو ماوە زۆرەی پێکەوە

بونماندا نەماندەزانی رێی تێدەچێت. باشترین بەشی پەیوەندییەکەمان ئەوەیە، سەرەڕای ئەو هەمو شتەی پیایدا تێپەڕبوین، ئێمە هێشتا بەتەواوی دڵسۆزی یەکترین و خۆشەویستییەکەمان نەمردووە.

**ئاسودەییەکەی ئێستامان بەجۆرێکە کە هەرگیز پێشتر لەو ماوە زۆرەی پێکەوە بونماندا نەماندەزانی رێی تێدەچێت.**

هەروەها ئەو راستییە گرنگە کە هەرچەندە شتەکان دژی ئێمە بونایە. ئێمە ئەوەندە بەهێز و ئامادەبوین کە کێشەکانمان چارەسەر بکەین، پابەندییە سۆزدارییەکەمان بۆ یەکتری بە بۆچونی من باشترین بەشی پەیوەندیەکەمانە لەم ماوەی سی ساڵ و قسوردا.

بەشە هەرە سەختەکەی پەیوەندییەکەمان بریتی بووە لە پەیوەندیکردن. هەردوکمان بەلامانەوە سەخت بووە پێویستی و داواکانمان لە یەکتری دەربڕین. ئەمە دەبێتە هۆی پەست بون کە هەندێك جار ماوەیەکی درێژ دەخایەنێت. بەڵام ئێمە ئێستا تێدەگەین داواکردن چەند گرنگە و لە گرنگی چۆنێتی باسکردنی ئەو شتانەی ئازارمان دەدەن لەلای هاوبەشەکەمان تێگەیشتوین.

بۆ نمونە، (دەیڤد) هەمیشە قژی درێژی منی بەلاوە پەسەند بووە، بەڵام هەرگیز باسی نەکردووە. من ئەوم بەبێ ریش بەلاوە پەسەند بووە بەڵام هەستم نەکردووە کە دەتوانم پێداگری بکەم. کاتێك هەردوکمان ئەوەمان بە دەست هێنا کە دەمانویست، هەستمان بە دڵخۆشییەکی زیاتر کرد. وا دیارە شتە بچوکەکان گۆڕانی گەورە دروست دەکەن.

بەشی (پەیوەندییکردن) لە کتێبەکەی (د. گرەی)دا بەناوی (پیاوان لە مەریخەوە هاتون و ژنان لە ڤینۆسەوە) لە پەیوەندییە رۆژانەکانماندا یارمەتی داوین. ئەو باسی (زمان)ە جیاوازەکانی ژنان و پیاوان دەکات و چۆنیش ئێمە بەشێوەی جیاواز لێکدانەوەیان بۆ دەکەین. ئەمە زۆر یارمەتیدام لە مامەڵەکردنمدا لەگەڵ (دەیڤ) کە کێشەی نارەحەتی دەرونی هەیە بەهۆی ئەزمونی شەڕی ڤێتنامەوە.

(دەیڤد) بەشداری شەڕەکانی ساڵانی ١٩٦٩ و ١٩٧٠ی کردبو. کە گەڕایەوە ئەو پیاوە

نەبو کە ناسیبوم و هاوسەرگیرییم لەگەڵدا کردبو. ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر (دەیڤد)دا هاتبون ئەوەندە زۆرن کە پێم وایە تەنیا دەتوانم هەرە زەحمەتەکانی لێرەدا باس بکەم:

• نەبونی هیچ جۆرە هەستێك جگە لە تورەیی و گومان و خەمۆکی لە هەندێك کاتدا (دواجار تێگەیشتین کە ئەم کاتانە ساڵیادی مردنی سەربازە هاوسەنگەرەکانی بون)؛ زۆر رەخنە دەگرێت و زوو هەڵدەچێت؛ و قۆشمەچێتییەکەی جارانی نەماوە.

• لە دەستدانی هەستی بیستن و گوێ زرنگانەوە، کە رۆژ لەدوای رۆژ خراپتر دەبێت.

• بێزاربون بە دەنگی هەلیکۆپتەر، تەقەمەنی، رێ و رۆیشتن، ئاهەنگ و کۆبونەوەی دیکە، و فیلمی جەنگی.

• لە قسەکردندا باسی ڤێتنام دەکات بەڵام وتووێژی جددی لەسەر ئەم بابەتە قبوڵ ناکات و ددان بەوەدا نانێت کە ئەم شەڕە کاری تێکردووە.

• پێویستی بەوە بووە لە شوێنێکی دیاریکراوی ژورەکەدا دابنیشێت، پشتی بنێت بە دیوارەکەوە و روبکاتە دەرگاکە.

• توشبونی بێ خەوی و کێشەی دیکەی خەو، بە تایبەتی لە نزیکی ساڵیادی کوژرانی کەسانی دیکە؛ سیانزە ساڵ لە ژوری نوستن لەسەر زەوییەکە دەخەون.

• بو بە کەسێکی ئالودەبو بە کارکردنەوە، بەڵام زو زو ئاواتەکانی دەگۆڕی، یەکەمجار دەبو بە خولیا بۆی پاشان فەرامۆشی دەکردن.

• ناوبەناو هەست و ئارەزوی نەدەما.

• بو بە کەسێکی فرە هەستیار - هەمیشە گوێی رادەگرت، چاودێری دەکرد؛ جۆرە کاردانەوەیەکی زیاد لە پێویست و لەپڕی لەلا دروست بو.

• کێشەی هەبو لە مامەڵەکردندا لەگەڵ مردن: نەیدەتوانی کاردانەوەی هەبێت بۆی.

• پێویستی بە کۆنترۆڵکردن هەبو؛ هەمیشە پێویستی بەوەبو سەرکردایەتی بکات، و کاتێك کەسێك شتێکی (هەڵە)ی بکردایە، ئەم کاردانەوی زیاد لە پێویستی دەنواند.

• سەخت بو بەلایەوە داوای ئەو شتە بکات کە دەیویستن؛ هەستی دەکرد شایستەی نییە.

پێویست بە وتن ناکات، ئەم هەمو گۆڕانکارییە فشاری خستە سەر هاوسەرگیرییەکەمان. بەڵام سێ شت یارمەتیداین بیپارێزین- چارەسەرکارێکی تێگەیشتو، کۆمەڵەیەکی سەربازە دێرینەکانی ڤێتنام، و دۆزینەوەی کتێب و

کاسێتەکانی (جۆن گرەی). بەڵام هاوسەرگیرییەکەمان رزگار نەکرایەوە هەتا توشی بارودۆخێکی روخێنەر نەبوین، کە خەریکبو ببێتە هۆی جیابونەوەمان.

بیرکردنەوە لەو ئەزمونە بۆ من سەخت و بە ئازارە - چ جای ئەوەی لەبارەیەوە بنوسم- تەنانەت ئێستاش. نزیکەی دو ساڵ و نیو لەمەوبەر، (دەیڤد) دانی بەوەدانا کە بۆماوەی سێ ساڵ پەیوەندی دەرەکی هەبووە. کۆتایی پێهێنابو، بڕیاری دابو کە بەراستی منی خۆش دەوێت و دەیویست دووبارە پێکەوە دڵخۆش بین. ویستی بچین بۆ راوێژکاری هاوسەرگیری و دواجار دانی بەوەدانا کە سەبارەت بە ڤێتنام کێشەی هەبووە.

من ماوەیەکی زۆر گومانم لە بونی ژنێکی دیکە هەبو، بەڵام ئەو هەستەم لە ناخی دڵمدا سەرکوت کرد، چونکە نەمدەتوانی بەرگەی واقیعەکە بگرم - هەرچەندە کابوسم هەبو لەروی جەستەییەوە نەخۆش کەوتبوم بەهۆی فشاری سۆزداری و نیگەرانییەوە. کاتێك ترسە گەورەکەم لەراستیدا هاتەدی، خەمم بۆ لە دەستدانی هاوسەرگیرییەکەمان خوارد و دەبو بڕیار بدەم کە ئایا بمێنمەوە یان بڕۆم. من بەتەواوی خۆم بۆ یەك پیاو تەرخان کردبو بە درێژایی تەمەنم و ئێستا بۆم دەرکەوتبو کە ئەو پیاوە چیتر هەر پیاوی من نییە.

کاتێك دەستمان کرد بە راوێژ وەرگرتن و (دەیڤ) پەیوەندی کرد بە کۆمەڵەی پشتیوانی لە سەربازە دێرینەکانی ڤێتنامەوە، هەستمان کرد پێویستمان بە دەستپێکردنەوەیەکی نوێ هەیە، (هاوسەرگیرییەکی نوێ)، بۆ ئەوەی ببینین بەو هاوبەشەی هەریەکەمان دەیەوێت. (دەیڤد) ریش و سمێڵی تاشی و بووەوە بەو پیاوەی کە من هاوسەرگیریم لەگەڵدا کردبو. من قژم درێژکردەوە بەو جۆرەی ئەو حەزی لێ بو. ئەڵقەیەکی نوێم بۆ کڕی کە "هەمیشە خۆشەویستی، (جان)"م لەسەر هەڵکۆڵیبو. کتێبەکانی (د. گرەی) ئەمجارەش یارمەتیدایین. وامان هەست کرد کە تەنیا بۆ ئێمە دەنوسێت و بیرکردنەوەکانمان دەزانێت. ساڵی رابردو، لەگەڵ خێزان و هاوڕێکانماندا ئاهەنگی ساڵیادی بیست و پێنج ساڵەی هاوسەرگیرییەکەمان گێڕا.

لە کۆتاییدا، دەبینین کە ئێمە بەسەر کێشەکانماندا زاڵ بوین چونکە هەردوکمان بەڕاستی دەمانویست پێکەوە دڵخۆش بین و هێشتا ئەوەندە یەکتریمان خۆش دەویست کە بتوانین لەناو ئەو هەمو ئازار و گەڕان و کارە زۆر سەختانەدا خۆشەویستییەکە

بپارێزین. هەوڵدانەکان شایستەبون، وەك من لە سەرەتادا گوتم، ئێمە ئێستا لەوکاتە دڵخۆشترین کە هاوسەرگیرییمان کرد.

دەتوانم بڵێم کتێبەکانی (د.گرەی) یارمەتیدەداین یەکتری وەك هاوڕێی رۆحی تەماشابکەین و هەستی پێبکەین؛ ئەو کتێبانە چاویان کردینەوە لەئاست ئەو خۆشەویستییەی هەمیشە هەمانبووە، بەڵام ماوەیەکی زۆر دورودرێژ شاردرابۆوە. هەندێك جار بارودۆخێکی روخێنەر دەکرێت رەحمەتێك بێت و خۆی لێ گۆڕیبێت. لە ناخی دڵمانەوە سوپاس، (د. جۆن گرەی).

(رۆبێرت) و (کریستاڵ)

(رۆبێرت) باسی ناپاکییەکانی خۆی کرد: من و کریستاڵ ماوەی دوانزە ساڵە هاوسەرگیرییمان کردووە. ئێمە سێ منداڵی سەرنجڕاکێشمان هەیە و ماڵێکی جوانمان هەیە. لە ماوەی شەش ساڵی یەکەمدا و پەیوەندییمان زۆر باش بو لە هەمو روویەکەوە. ئێمە هەردوکمان چارەسەرکاری سەرکەوتو بوین. هەمو شتێکی هاوسەرگیرییەکەمان نمونەیی بو جگە لە یەك شت: من دەستم کرد بە پەیوەندی دەرەکی.

تەنانەت لەسەرەتاوە دڵنیا نەبوم لەوەی کە بتوانم لەگەڵ چەند ژنێکدا پەیوەندییم هەبێت، بەڵام هەوڵم دا. (کریستاڵ) ژنێکی جوانە بەڵام پاش ماوەیەك ئەو هەستەم لە دەستدا کە بە سەرنجڕاکێشی بزانم. کاتێك پێکەوە دەبوین، بیرم لە ژنی دیکە دەکردەوە. کاتێك لە کەنار دەریادا تەماشای ژنی دیکەم دەکرد توشی مشتومڕ دەبوین. ئەو دەیزانی کێشەیەك هەیە بەڵام نەیدەزانی دەبێت چی بکات. بە هێواشی هەمو شتەکان گۆڕان.

دواجار دەستم کرد بە جێبەجێکردنی ئارەزووەکانم. لە ماوەی سێ ساڵدا چەند پەیوەندییەکی دەرەکیم دروست کرد. وام هەست دەکرد ئەگەر بتوانم فەنتازیاکانم بهێنمە دی، ئەوا دووبارە دەبمەوە بە هاوسۆزی (کریستاڵ). لە سەرەتادا ئەمە سەرکەوتو بو، بەڵام پاش ماوەیەك هەمو پەیوەندییەکەمان بەرەو خراپی گۆڕا.

من توشی خەمۆکی بوم. من یارمەتی خەڵکم دەدا لە ژیانیاندا بەڵام ژیانی خۆم بەرەو فەوتان دەچو. (کریستاڵ) دەگۆڕا. چیتر دڵخۆش نەدەبو بە بینینی من؛ هەرچییەکم بۆ بکردایە دڵی پێی خۆش نەدەبو. هەمو شتێك لە دەرەوە جوان بەڵام

لە ناوەوە سڕ و بێگیان بو.

دوای خوێندنـەوەی کتێبەکـەی تـۆ، بـۆم دەرکـەوت کـە پێویسـتە پـێی بڵـێم. لـەوە نەدەچو هیچ کۆنترۆڵێکم هەبوبێت بەسـەر ئـەو مەسـەلەیەدا، و تـەنیا ئـازاری دەدام کـە لێی بشارمەوە. من بە نامەیەك پێم گوت. ئەو زۆر توڕە و ناڕەحەت بـو. هەسـتێکی زۆر خراپم لا دروست بو. بەڵام لانی کەم دەرم بڕی.

چوین بـۆ راوێـژ وەرگـرتن. پرسـیاری زۆری کـرد لـە بـارەی کات و شـوێنەکانی ئـەو پەیوەندییـە دەرەکیانـە. هەسـتێکی زۆر دەربـڕدرا. زۆر گـوێم گـرت. ئـەوە کـاتێکی زۆر سەخت بو، بەڵام دواجار توانی کە لێم ببورێت و دووبـارە خۆشـی بـوێم. سـڕێتییەکەی لاچو. لەودیو هەستی توڕەیی و ناڕەحەتییەکەیـەوە ژنێکـی ناسـکی جـوانی خۆشەویست هەبو کە پێویستی بە خۆشەویستی من بو. منیش ناپاکییم لەگەڵدا کردبو.

سەیر لەوەدا بو کە بۆم دەرکەوت هـەرگیز ئەوەنـدە هەسـتم نـەکردووە هێنـدە خۆشـم دەوێـن. ناڕەحـەتی لـەوەی کـە ئـازارم پێگەیانـدووە وای لێکـردوم دووبـارە بتـوانم هەسـت بکەمەوە. دەستم کردەوە بە هەستکردن بـە لایەنـە سەرنجڕاکێشـەکانم لای ئـەو. بـەڵام بـۆ ئــەوەی بەتــەواوی ســاڕێژ ببێــت و ئــازار و ترســەکانی بــەرەڵا بکــات، داوای لێبوردنــەکانم، خۆشەویستی و سەرنجڕاکێشییەکانم بەس نەبون، ئـەو پێویسـتی بـە پـەیامێکی دڵنیاکـەرەوە هەبو کە لەمەولا هەرگیز درۆی لەگەڵدا ناکەم و پەیوەندی دەرەکی دروست ناکەم.

**ناڕەحەتی لەوەی کە ئازارم پێگەیاندووە وای لێ کردوم**
**دووبارە بتوانم هەست بکەمەوە.**

نەمدەزانی چی بڵێم. چۆن دەتوانم دڵنیای بکەمەوە؟ ئەی ئەگـەر جـارێکی دیکـە وام لێ هـات ئـەو سـەرنجم رانەکێشـێت - چـی بکـەم؟ مـن هێشـتا سـەرنجی ژنـانی دیکـەم رادەکێشا. دەمتوانی بـەڵێن بـدەم چیتر درۆ نەکەم، بـەڵام نەمـدەتوانی بـەڵێن بـدەم کـە ژنی دیکە سەرنجم رانەکێشن.

پـێم گوت خۆشـم دەوێیـت بـەڵام هێشتا ژنـی دیکـە سـەرنجم رادەکێشـن. ئەمـە زۆر ئازاری پێگەیاند. هەر کاتێك لە نزیك ژنێکی جوانی دیکـەوە بوینایـە، بێتاقـەت دەبـو.

وای دەزانی من ئەو ژنە سەرنجی راکێشاوم، بەڵام وانەبو.

پاشان ئێمە تەماشای سیمینارە ڤیدیۆییەکەی تۆمان کرد. کاتێك تۆ باسی فرەهاوسەری ئەقڵییت کرد، ئەوە بە تەواوی پەیوەندییەکەمانی رزگار کرد. کاتێك تۆ گوتت پیاو دەتوانێت ژنەکەی خۆش بوێت و ژنەکەی سەرنجی رابکێشێت و هەروەها دەتوانێت ژنی دیکە سەرنجی رابکێشێت، ئەو کاتە هەردوکمان ئاسودە بوین. تۆ گوتت ئاساییە بۆ پیاوان ژنانی دیکە سەرنجی رابکێشن بەڵام نهێنی فرەهاوسەری ئەوەیە فێر ببیت چۆن ئەو وزەیە ئاراستە بکەیتەوە بۆ هاوبەشەکەت.

ئەمە ئاسانترین راهێنانی دیسپلین بو کە تا ئێستا ئەنجامم دابێت. هەر کاتێك ژنێکی دیکە سەرنجی راکێشابم، بە کورتییەکەی خەیاڵم لە سێکسکردن لەگەڵ (کریستاڵ) دەگۆڕدەوە. ئەمە زۆر ئاسان بو - سەرکەوتوش بو. ئێستا لە هەمو کاتێك زیاتر سەرنجم لەسەر (کریستاڵ)ە. فرەهاوسەری بڕیاری زیندانیکردن نییە، بەڵکو هەمو ئەو شتەیە کە من دەمەوێت.

پاش تێپەڕبونی سێ ساڵ من هێشتا وادەکەم. ئەگەر هەست بکەم بەهۆی ژنێکی دیکەوە دەوروژێم، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی فەنتازیا بە ژنەکەمەوە دەکەم. حەزم لێیە. من کەسێکی زۆر وێناکەرم و ئێستا هاوسەرەکەم بالاترین خۆشەویستی و فەنتازیامە. هەست دەکەم دڵخۆشترین پیاوی جیهانم.

**(نانسی) و (بێڵ)**

(نانسی) ئەم چیرۆکەی گێڕایەوە: من و (بێڵ) لە سەرەتاوە زۆر گونجاو بوین - ئەمەش وای کرد زۆر زو پێك بێین. بڕوام وایە خوا دوو سەرخۆشەکەی لەگەڵ یەکدا کۆکردەوە بۆ ئەوەی هوشیار ببنەوە.

زۆر بە زویی، (بێڵ) وای لێ هات کە سەرخۆش دەبو کێشەی دروست دەکرد، و من بە درێژایی شەو دەمامەوە و بیرم دەکردەوە و پرسیارم لە خۆم دەکرد. ئایا لەم پەیوەندییەدا بمێنمەوە یان بەجێی بهێڵم؟ چی باشە بیکەم بۆ بەیانییەکەی چوم بۆ زیندان بە شوێنیدا. زۆر خراپ بو.

لێم پرسی: (چی بکەم؟)

بێ هیچ دوودڵییەك گوتی (بمبە بۆ كۆبونەوەی ئالودەبووە نەناسراوەكان AA).

منیش وام كرد. ئەوە یەكەم كۆبونەوەی لەوجۆرەمان بو. هیچ كام لە ئێمە شتێكی خوایی یان بونێكی بالاَ لە ژیانماندا نەبو. بەلاَم هەر كە چوینە ناوەوە، بۆم دەركەوت كە ئەمە شوێنی خۆمانە، هی هەردوكمان من و (بێڵ). منی بە درێژایی ژیانم بۆ خوا و بۆ ئەو شوێنە گەڕاوم كە دەمزانی سەر بەو شوێنەم. لەو كۆبونەوەیە یەكسەر ئەو شتانەم دۆزییەوە.

---

**بڕوام وایە خوا دوو سەرخۆشەكەی لەگەڵ یەكدا**

**كۆكردەوە بۆ ئەوەی هوشیار ببنەوە.**

---

شەش مانگ دوای ئەوە، من و (بێڵ) هاوسەرگیرییمان كرد. بۆ مانگی هەنگوینی چوین بۆ فەرەنسا. لەوێ خەڵك لە بەیانی تا ئێوارە دەیانخواردەوە. ئێمە كاپوچینۆمان خواردەوە. كە گەڕاینەوە، دەستمان كرد بە كاركردن و دواجار خانویەكمان كڕی.

ئەمە ئەو كاتەبو كە ئیتر شتەكان بەرەو گۆڕان دەچون. هاوسەرگیرییەكەمان وادیاربو لەت ببێت، و لەیەكتر دوردەكەوتینەوە. وام هەست كرد كە ئێمە تەنیا هاوژورین- نە سێكس، نە ڕۆمانس، تەنانەت یەكتریشمان نەدەبینی.

بەلاَم لە شوێنی كارەكەم پیاوێكی لێ بو كە زۆر تێگەیشتو دیاربو. چوم بۆ لای و كێشەكانی خۆمم لەگەڵ هاوسەرەكەمدا بۆ باس كرد - ئەو پێی گوتم جوانیت و مێشكی پڕ كردم لەو شتانەی كە پێویستم پێی بو لە هاوسەرەكەم بیانبیستم. ڕۆژێكیان، ئەم پیاوە هات بۆ ماڵەكەم. دوام كەوت بۆ ژووری نوستنەكەم كە خۆم تیا دەگۆڕی. پێی گوتم (ئەمە ویستی خوایە.) و هاوسەرەكەم خۆی كرد بە ژوری نوستنەكەدا.

كاتێك (بێڵ) ئێمەی بەیەكەوە بینی، سەیرترین شتی گوت: (نانسی)، كاتێك تۆ تێك دەشكێیت و لەگەڵ ئەم پیاوەدا دەسوتێیت، من لەوێ دەبم پارچەكان كۆدەكەمەوە.

نەمانزانی چی بكەین. من و (بێڵ) بە درێژایی شەو قسەمان كرد. ئایا هاوسەرگیرییەكەمان كۆتایی هاتبو؟ ئایا پێویست بو جیا ببینەوە؟ ئایا هاوسەرگیرییەكمان دەویست كە لەسەر بۆش بنیاد نرابێت، كە بەدەگمەن یەكترمان

دەدی و هەرگیز سێکسمان نەدەکرد؟ بە راستی نەماندەزانی چی بکەین. داوام لە (بێڵ) کرد لەگەڵما بێت چاومان بە راوێژکاری هاوسەرگیری بکەوێت. دوو رۆژ دواتر کتێبی (پیاوان لە مەریخەوە هاتون و ژنان لە ڤینۆسەوە)م بە دەستەوە گرت.

بەرنامەمان دارڕشتبو بۆ پشو وەرگرتن، بەڵام دوای خوێندنەوەی کتێبەکە، وتم (با بەرنامەکەمان بگۆڕین و رێگەیەك بدۆزینەوە قسە لەگەڵ (د. جۆن گرەی) بکەین. وا دەزانم ئەو دەتوانێت یارمەتیمان بدات.

(بێڵ) گوتی "هەرچی تۆ بیلێیت (نانسی)، من نامەوێ ببینم هاوسەرگیرییەکەمان بەم شێوەیە کۆتایی دێت."

چوین بۆ سیمینارەکەی (جۆن گرەی) و دانیشتین و دەممان داچەقاند. (د. گرەی) باسی ئەو شتانەی دەکرد کە من پێویستم پیّ بو — ئەوەی من وەکو (نانسی) پێویستم پیّبو — بۆ ئەوەی هەست بکەم خۆشیان دەوێم. تەنیا گوێم لێ بگرە (بێڵ). هەوڵ مەدە کێشەکانم بۆ چارەسەر بکەیت. تەنیا ئامادەبە لەلام. تەنیا گوێ بگرە رۆژ تا ئێوارە چی دەکەم. پێش ئەو سیمینارە، (بێڵ) دەیگوت (نانسی)، دەتوانم چیت بۆ بکەم؟) ئێستا تەنیا گوێ بۆ قسەکانم رادەگرێت.

منیش فێربوم پێزانینم بەرامبەر بەو هەمو شتە بچوکانە هەبێت کە بۆم دەکات. فێری ئەو پێنچ شتە بوم کە پیاو پێویستی پیّیە بۆ ئەوەی هەست بکات خۆشەویستە. فێری گرنگییە گەورەکەی شتە بچوکەکان بوم — ئەو باوەشە زیادە، ئەو ماچە زیادە — و فێربوم چۆن پێزانینم هەبێت بۆ ئەو شتانە.

هەرچییەك فێری دەبوم وای دەکرد هەست بکەم کە ئەوە رێك ئەو شتە بو کە هەردوکمان پێویستمان بو بیبیستین بۆ ئەوەی هاوسەرگیرییەکەمان رزگار بکەین. من لەماوەی ئەو سی ساڵەدا هەمو ئەو شتانەم فڕیّدابو کە ئێستا پێویستم پیّیان بو و ئێستا لەو سیمینارەدا هەمویانم بە دەست دەهێنایەوە. هەردوکمان وابوین.

ئەو کۆتایی هەفتەیە من و (بێڵ) لە سەرەتاوە عاشقی یەکتر بوینەوە. دوای ئەو سیمینارە، سێکسمان کرد، و رەنگە ئەوە باشترین سێکس بوبێت کە کردبێتمان.

سیمینارەکە هەمو شتێکی بۆ گۆڕین. باشترین شت ئەوەیە کە من ئێستا خەریکم

دەست بە کارێکی نوێ بکەم کە زۆرم حەز لێیە. پێشتر، بەو شێوەیەی ئەوسام هەستم نەدەکرد شایستەی هیچ شتێك بم. بەڵام ئەوەی کۆبونەوەکانی (AA) و لە (جۆن گرەی) فێری بوم یارمەتیدام خۆشەویستی بکەم وەك چۆن ئێستا خۆشەویستی دەکەم — ئەمە خەونێکە هاتۆتەدی.

ئەم کریسمسە بڕیارمدا شتێکی زۆر رۆمانسی ئەنجامبدەم بۆ هەردووکمان. هاوسەرەکەم چێشتلێنەری خێزانەکەمانە، بەڵام بڕیارمدا من خواردنی کریسی راستەقینە دروست بکەم. هەمو جۆرەکانی خواردەمەنی لاوەکی دروست کردبو، و گۆشتم برژاندبو- پێویستم بەوە بو تەلەفونێکی زۆر بکەم بۆ ئەوەی ئەم شتانە بەباشی دەربچن، چونکە پێشتر هەرگیز خواردنی وام ئامادە نەکردبو، نەشمدەویست پرسیار لە (بێڵ) بکەم. پاشان گۆرانییەکانی (نێیل دایمۆند)مان خستەسەر، مۆممان داگیرساند، لەسەر مێزی نانخواردنەکە دانیشتین و باسی ئەو نیعمەتانەمان کرد کە هەمانبو.

ئەم کریسمسە تەنیا بەناو مۆمەکاندا تەماشای یەکتریمان کرد و سوپاسگوزاریمان دەردەبڕی هەمو ئەو شتانەی کە رویانداوە.

پەیوەندییەکەی دایك و باوکم زۆر ناسەرکەتو بو، بەڵام باپیرم و دایە گەورەم زیاد لە شەست ساڵ پێکەوە مانەوە. هەمیشە دوعا دەکەم و سوێندم خواردووە وەکو دایە گەورەم وابم. هەمو کریسمسێك دایە گەورەم لیبوکێکی فەخفوری دەدامێ، وەکو نەریتێکی خێزانەکەمان. ئەم کریسمسە دایە گەورەم مرد، بەڵام (بێڵ) دیارییەکەی خۆیی دامێ، و کاتێك کردمەوە، ئەمە بو: لیبوکێکی فەخفوری. کەواتە نەریتەکە زیندووە، و رۆحی دایە گەورەم لە خێزانەکەی مندایە. و هەروەك باپیر و دایە گەورەم، من و (بێڵ) بە نیازین پێکەوە بژین. تا مردن.

## دوا وتە

ئێستا لە هەمو کاتێکی مێژو زیاتر گوشار لەسەر پەیوەندییەکانە. لەگەڵ ئەمەشدا، رێژەی بەرزی جیابونەوە، مانای وانیە کە خەڵك کەمتر یەکترییان خۆش دەوێت، بەڵکو نیشانەی ئەوەیە کە خەڵك داوکاریی زیاتری لە پەیوەندییەکانی دەوێت. جاران، ژنان و پیاوان یەکیان گرت بۆ بە دەستهێنانی ئاسایش. ژنان و پیاوان پێویستیان بە یەکتر بو بە شێوەیەکی سەرەکی بۆ مانەوە. ئەمڕۆ ئەوە بەس نییە؛ ئێمە ئێستا بە شێوەیەکی سەرەکی بۆ بەدەستهێنانی خۆشەویستی و دڵخۆشی و ئاسودەیی رودەکەینە یەکتری.

کەپڵەکان دەتوانن بە درێژایی تەمەن، پێکەوە لە خۆشەزیستیدا گەشە بکەن بەڵام ئەمە پەروەردە و راهێنانی پێویستە. چەماوەیەکی فێربون هەیە، کە لە سەرەتادا رەنگە ماندوکەر بێت. تەنانەت بە باشترین مەبەستیشەوە، جاری وا هەیە ون دەبین و پەیوەندییمان دەپچڕێت و رەنگە بکەوینە دەرەوەی خۆشەویستییەوە، بەڵام پشوودرێژیی و رێنمایی دروست دەتوانین دووبارە خۆشەویستییەکە بدۆزینەوە. وەك

دوو هاوڕێی خۆشەویستی یەکتر کە بە خۆشییەکی زۆرەوە دوای گەڕانێکی دورودرێژ یەکتر دەدۆزنەوە، پیاوان و ژنان دەتوانن بە شێوەیەکی سیحراویی هەمو جارێك بکەونە خۆشەویستی یەکترەوە.

هیوادارم چیرۆکەکانی ئەم کتێبە ببنە ئەو سەرچاوەی ئیلهامەی کە ئێوە بتوانن جار لەدوای جار بگەڕێنەوە بۆی. ئەگەر تۆ لە پەیوەندییەکانتدا برینی سۆزدارییت ئەزمون کردووە، ئەم چیرۆکە راستەقینانە دەتوانن ئیلهام بە ناخت ببەخشن کە دەتوانیت رابردو سارێژ بکەیت و دوبارە دەست پێبکەیتەوە. ئەگەر پەیوەندییەکانت خۆیان بەهێزن، ئەم چیرۆکانە دەتوانن وەك بیرخەرەوەیەك سودت پێبگەیەنن کە چ رێگەیەك سەرکەوتووە. ئەم کتێبە بدە بە خێزان و هاوڕێکانت، باسی ئەم چیرۆکانە بکە و بەدوای دڵەکاندا بگەڕێ، کە تیایاندا خۆشەویستی لەپڕ بەهێز دەبێت و دەبوژێتەوە.

لەم لاپەڕانەدا ئەو کەسە راستەقینانەمان بینی کە ئیلهامیان هەبو خۆشەویستی بکەنە یەکەم مەسەلەی ژیانیان، و هەمو شتێکی پێویست ئەنجام بدەن لە پێناوی هێشتنەوە و پاراستن و خزمەتکردنی ئەو خۆشەویستییە و هێشتنەوەی جادوی ئەو خۆشەویستی بە زیندویی و لە گەشەکردنی بەردەوامدا. جار لەدوای جار، ئەم نمونە راستەقینانە هێزی ئەو خۆشەویستی دەردەخەن هەروەها فێرمان دەکەن کە هەرچۆنێك بێت پردەکانی پەیوەندییەکانمان جار لەدوای جار دروست بکەینەوە. من بوێریی ئەم کەسانە پەسەند دەکەم — بوێرییەکەیان لە هەوڵی سەرخستنی خۆشەویستی، بوێرییەکەیان بۆ کرانەوە بەروی بیرۆکەی نوێ و زانیاری نوێدا و بوێرییەکەیان بۆ سەلماندنی ئەو راستییە بە هاوبەشەکەیان و بە جیهان کە خۆشەویستی شایانی هەوڵدانە. سوپاس کە کاتتان بۆ ئەوە تەرخان کرد خۆشەویستی لە ژیانتاندا سەرکەوتو بێت، و سوپاس کە رێگەتان دا من بەشێك بم لەم پرۆسەیە.

## دەربارەی نوسەر

د. جۆن گرەی، پسپۆڕێکە لە بواری پەیوەندی و گەیاندن و لەسەر ئاستی جیهاندا ناسراوە، نوسەری دوانزە کتێبی هەرە پڕفرۆشە، ماوەی سی ساڵ کۆڕی گەشەپێدانی گێڕاوە. چارەسەرکارێکی خێزانی‌یە. خاوەن بڕوانامەی (ئەکادیمیای نەتەوەیی بۆ چارەسەرکارە خاوەنبڕوانامەکان) و نوسەری راوێژکار لە (زەفامیلی جۆرناڵ)، و ئەندامی بۆردی راوێژکارە دیارەکانی یەکێتی راوێژکارەکانی هاوسەرگیریی و خێزان، و هەروەها ئەندامی یەکێتی راوێژکارە ئەمریکییەکانە. جۆن لەگەڵ ژن و سێ مناڵەکەیدا لە باکوری کالیفۆرنیا دەژین.

## کتێبەکانی دیکەی د. جۆن گرەی

مەریخ و ڤینۆس لە شوێنی کاردا
موعجیزەی پراکتیکی بۆ مەریخ و ڤینۆس
منالآن لە بەهەشتەوە هاتون
چۆن ئەوە بە دەست بهێنیت کە دەتەوێت و ئەوەت بوێت کە هەتە
پیاوان لە مەریخەوە هاتون، و ژنان لە ڤینۆسەوە — کتێبی رۆژەکان
مەریخ و ڤینۆس لە ژواندا
مەریخ و ڤینۆس پێکەوە هەتا سەر
مەریخ و ڤینۆس لە ژوری نوستندا
ئەوەی دایکت نەیتوانی پێت بلێت و باوکیشت نەیدەزانی
پیاوان لە مەریخەوە هاتون و ژنان لە ڤینۆسەوە
پیاوان و ژنان و پەیوەندی
ئەوەی هەستی پێدەکەیت، دەتوانیت چارەسەری بکەیت